## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: دەریای ژیان

ئامادەکردنی : عبدالباسط عبدالرحمن

چاپ : چاپی یەکەم ٢٠١٥

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

شوێنی چاپ: چاپخانەی رۆژهەلآت/هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی (٩٠٢) ی ساڵی (٢٠١٤) ی پێدراوە

# بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

الحمدُاللهِ رَبِ العالمين والصلاةُ والسلام على سيدنا مُحَمد وعلى آلِهِ وصحبهِ أجمعين .

ژیانی دونیا وەك دەریایەکە کە پڕێتی لەزیندەوەری بەسوودو شتی بەنرخ و گرانبەها، لەهەمان کاتیش پڕە لەمەترسیەکانی شەپۆڵ و گێژە لووکەو دڕندەو تاریکی، ئێمە هەمووومان لەو دەریایە مەلە دەکەین و هەریەکەو بەجۆرێك ژیانی تێدا دەگوزەرێنین .

پێویستە بۆهەریەك لەئێمە هەوڵی بەدەست هێنانی شتە بەنرخ و گرانبەهاكان بدەین، ئەو مەبەست و ئامانجە بپێكین كە لەدوای پەڕینەوەشمان لەو دەریایە خۆشبەخت ببین، دەبێ ووریابین لەو دەریایە، وەك كەسێك مەلەنەكەین كە نەزانێ مەلە بكات و بەئاسانی بخنكێ و تەمەنی لەهیچ و خۆڕایی بەهەدەربدات. ئاخر چۆن دەبێ نیوەی تەمەنت لەدەریای ژیان بەسەربەریت و نەزانی مانای ژیان چی یە، نەزنی چۆن ڕەفتار بكەی . ؟؟

زۆرێك لەئێمە ژیانی خەڵكانێك دووبارە دەكەنەوە كەهەموو ڕابردوویان پڕبووە لەگوناهو خراپەكاری و هیچ ئامانجێكیان نەبووە بۆ خۆشبەختی ڕۆژی دواییان، بڕوانە لەنێو كۆمەڵگەكەمان هەموو شت بووبە چاولێكەری و لاساییكردنەوە، هەرچی گوناهو خراپەكاریە لەسەر بنەمای چاولێكەرییە، تەنانەت خۆكوشتنیش بووبە چاولێكەری، جاران داناكان دەیان ووت : جۆری مەرگ بەویستی خۆمان نیە، بەڵام شێوازی خۆبەڕێوەبردنی ژیان خۆمان

هەڵیدەبــژێرین. کەچــی کەســانێکمان بــەهۆی تێنەگەیــشتنیان لــەمانای ژیــان مەرگیان وەك مـارێکی ژەهراویـی لەدەست و ملـی خۆیـان ئاڵانـدوە و هـەرکاتێك بەرگەی غەمەکان نـەگرن، کۆتـایی بـەژیانی خۆیـان دێـنن، ئـەو تێنەگەیـشتوانە ئەوەندە لەژیان دەترسن خۆکوشتن بەلایانەوە زۆر شتێکی ئاساییە.

لەدێر زەمانەوە ووتراوە : ژیان ئـەوە نـی یـە لێ ی بترسـی بـەڵکو ئەوەیـە لێ ی تێبگەی.

مەبەست لە نووسینی ئەم کتێبە، هەم بەسەرهاتەکان و هەم ووتەکانی ژیـان ، تەنها وویستوومە لەوئامانجانـە خۆمـان نزیـك بکەینـەوە کـە سـەرفرازی دونیـاو ڕۆژی دواییمان تێدا فەراهەم بکەین .

هیواخـوازم، خوێنـەرانی بـەڕێز لەخوشـك و برایـانم بۆمـاوەی ١٠دە ڕۆژ، هـەر ڕۆژێکیش چـەند سـاتێك گەشتێك بـەنێو ئـەم کتێبـە بکـەن، بەئومێـدی ئـەوەی بەبیرو هۆشێکی فراوانترو دڵ و دەروونێکی پڕ ئومێدەوە بڕواننـە ژیـانی دونیـاو ڕۆژی دوایی. دوعای خێر بۆ برای بەنـدکراوتان و دایك و باوکم بکەن .

**بەندکراو**

**عبدالباسط عبدالرحمن**

**١٤٣٦ کۆچی ٢٠١٥ ڕۆمی**

**گرتووخانەی هەولێر**

# بەناوی خودای دانا

سێ پیتە ((ژ)) لەووشەی ژیان

دووخاڵ خۆت لایدە، ئەبێ بەزیان

خۆتێدەگەی مانای چی یە زیان

واتە : ڕۆیشتنی شادی و هاتنی ژان

# (( زیندان ))

## ژیانی زیندانیان

پێویستە سەرەتا لەژیانی هەندێ لەزیندانیان دەست پێ بکەم، چوونکە خودی زیندان و ژیانی زیندانیان، سەرتاپا پەندو وانەیە، هەروەها بەسەرهاتەکان لێمانەوە نزیکن بۆیە کاریگەری زیاتری لەسەرمان دەبێت، بەتایبەتی لەڕۆژگارێکی وەکوو ئەمڕۆ کێشەو گیروگرفتە کۆمەڵایەتیەکان گەیشتۆتە ئەوپەڕی لووتکەی فەسادی و بەد ئەخلاقی، سەرەنجامەکەشی بەکوشتن یاخود بەلێك ترازانی شیرازەی خێزان کۆتایی دێت، وە ئەوکەسەشی بەکوشتنەکە هەڵدەستێت زۆرجاران بەهۆی بەهەڵە تێگەیشتنێتی لەڕووداوەکان، یاخود بەهۆی پەروەردەیەکی نارێك و خراپ، وا لەوکەسە دەکات ڕۆژگارێکی دوورو درێژ لەودیوی شیشەکانی زیندانەوە، بەداخ و پەژارەوە ڕۆژەکانی بەسەر ببات .

جگە لەمانەش ئەم بەسەرهاتانە، وانە وەرگرتنێکە بۆ ئەو گەنجە سەرە ڕۆیانەی ئەمڕۆ، لەکاتێکدا کەلەوپەڕی خۆش گوزەرانی ژیان بەسەر دەبەن، بەڵام ناتوانن سوود لەکاتەکانی ژیانی خۆیان وەربگرن، ئەوەش بەهۆی هاوڕێیەتیان لەگەڵ کەسانی خراپ و ڕێ نیشاندانیان بۆ شوێنی خراپ و ئەنجامدانی تاوانی جۆراو جۆر، وەك مەی خواردنەوە و قومارکردن و کاری داوێن پیسی و چەندەها تاوانی تری بەدوادێت،سەرەنجامەکەشی دەبێتە هۆی دابڕانیان لەخێزانیان و ئینجا بەرەو گۆشەی زیندان،

جا بۆیە حەزم کرد دووبەسەرهاتی ڕاستەقینەی نێو زیندان بخەمە ڕوو، بەهیوای سوود وەرگرتن لێ ی .

منتدى اقرأ الثقافي

# ژیانی بێ سەروبەر
## (( هەتا سەرئێسقان پەشیمانە ))

بەندکراوێك سەرەتا لەگەڵ ئەوەدانەبوو بەسەرهاتەکەی بنووسمەوە، بەڵام دواتر بەومەرجە ڕەزامەندی خۆی نیشاندا کە بەهیچ شێوەیەك ناوی خۆی و ناونیشانی خانەوادەکەی نەنووسم ! منیش ئەوپەڕی بەڕێزەوە داوایەکەم قبوڵ کرد، ڕێزێکی تایبەتیم بۆخۆی و خانەوادەکەشی هەیە.

ئەو بەندکراوە تاوانەکەی کوشتنە، کوشتنی نزیکترین کەسی خۆی، ئەویش کوشتنی خوشکیەتی، ئەو خوشکە بێ تاوانەی هیچ کارێکی خراپەی ئەنجام نەدابوو، وەك خۆی دەڵێ من لەگەڵ هیچ کەسێك خوشکم نەبینیبوو، تەنها گومانم لێ دەکرد پەیوەندی لەگەڵ کەسێك هەبێت، بەوهۆیەوە گومانم لەلا دروست بوو کە لەسەر ڕووی دەفتەرەکەی چەند پارچە شیعرێکی بەدەستی خۆی نووسیبوو .

ڕۆژانە لەماڵەوە دەمەقاڵێم لەگەڵ دەکرد، ئەویش زۆر بەئارامی و بەزەردەخەنەوە ئارامی دەکردمەوە و دەیووت : براکەم ئەوە چیت بەسەرهاتووە بەم شێوەیە دڵپیسی لەمن دەکەی ؟، دڵنیابە ڕەوشتی من زۆر لەوە بەرزترە کەتۆ گومانم لێ دەکەی، لەوانەیە لەخۆتدا بەدی بکرێ، بەڵام لەمن مەحاڵە ئەو هەڵس و کەوتانە بەدی بکەی، لەمن دڵنیابە بەوپەڕی سەربەرزیەوە ماڵەوەمان دەپارێزم، بەڵکو تۆ ئاگات لەخۆت بێ نەکەویە نێو ئەم جۆرە کردەوانە.

ئەو دەمەقاڵێیە نزیکەی هەفتەیەك لەماڵەوەیان بەردەوام بوو، هەرچەندە ئەندامانی خانەوادەکەیان هەوڵی خۆیان دا کۆتایی بەو دەمەقاڵێیەی نێوانیان

بهێنن، خوشکەکەی پەیمانی دا چیتر وەڵامی نەداتەوە، بەڵام ئەو لەسەر ئەوهات و هەڵایەی خۆی بەردەوام بوو، ئیتر لەبێ دەنگی خوشکی تووڕەبوونی زیاتر بوو، لەکۆتایی دا خوشکەکەی خۆی خەڵتانی خوێن کردو کۆتایی بەژیانی ئەوهێنا، خانەوادەکەیان سەرەتا وایان بڵاوکردەوە کە کچەکەیان بەخۆی خۆی کوشتوە، دایکیان لەتاو جەرگ سووتانی خۆی حەزی نەکرد کوڕەکەش بکەوێتە زیندان، بۆیە سکاڵایان لەدادگا تۆمار نەکرد، بەڵکو کوشتنەکەیان خستەوە سەر خودی کچەکەیان .

ئەو خانەوادە بەغەم و پەژارەیەکی زۆر پرسەکەیان بەڕێوەبرد، ئەو تاوانبارە زۆر پەشیمان بۆوە، هەستی کرد گەورەترین ستەمی لەماڵەوە کردووە، دوومانگ دوای ئەو ڕووداوە تاڵە، دایکی بانگی کوڕەکەی خۆی کردو بەئارامیەوە پێ ی ووت : کوڕم تۆ لەهیچ و خۆڕایی دڵ و هەناوی منت داغ کرد، ئێستا داوایەکم هەیە دەبێ بۆم جێ بەجێ بکەی !

کوڕە تاوانبارەکەش ئامادەبوو هەموو شتێك بۆخانەوادەکەی ئەنجام بدات، تەنها بەمەبەستی ئەوەی ئەو ڕووداوەیان لەیاد بباتەوە .

دایکی ووتی : فڵان کچی پوورت کە خوشکەزای منیشە، من وەك فڵانی کچی خۆمی دەبینم ، ئەگەر ئەوبخوازی لەماڵەوە هەردووکتان ژیان لەگەڵ من بەسەر ببەن بەدڵنیاییەوە غەم و ناڕەحەتیەکانم کەمتر دەبێتەوە، چوونکە ئەو کچی خوشکمە وەك کچەکەی خۆم دەیبینم، هەروا دەزانم ئەو زیندووبۆتەوە.

کوڕە تاوانبارەکەش دەست بەجێ بەدایکی ووت من ئامادەم ئەوکچە پوورەم بخوازم، مادەم ئارامی بەتۆ دەبەخشێ، پەیمانت پێ دەدەم ئەوکارە بکەم .

دوای ماوەیەك ئەو تاوانبارە، کچە پوورەکەی خۆی خواست و توانی بەم هۆیەوە جۆرێك لەئارامی بەدایکی ببەخشێت، ئەوماوەیە جۆرێك لەئارامی باڵی بەسەر ئەوخانەوادەیە کێشا، خەریك بوو مەرگی ئەوکچەیان لەیاد بچێتەوە، بەڵام یەکێ لەئەندامانی ئەوخانەوادەیە هەرگیز ئەوتاوانەی لەیاد نەدەچۆوەو لەڕووخساریەوە ڕۆژ بەڕۆژ سستر دەبوو، بۆیە زۆر لە برایەکەی پەست ببوو، خۆی پێ نەگیراو هاواری لێ هەستاو بەرەو دادگا ڕۆیشت و سکاڵای لەسەر براکەی تۆمارکرد، بەڕاشکاوانە بەدادوەری ووت : من لەتاو خوشکم وویژدانم ئازارم دەدات، چیتر ناتوانم ئەوتاوانەیە لەدڵم بنێژم، دەست بەجێ دادوەر بڕیاری دەستگیر کردنی ئەو تاوانبارەی دەرکرد، لەدوای دەستگیرکردنی بەتەواودتی دانینا بەکوشتنی خوشکەکەی .

دواتر لەدادگا سزای چەند ساڵ زیندانی کردنی بەسەر سەپێنرا .

دوای ماوەیەك لەزیندان هاتە لای من و سەرەتا هەموو ئەم ڕووداوەی بۆگێڕامەوە دواتر ووتی : من داوایەکم لەتۆ هەیە دەبێ بۆم جێ بەجێ بکەی ،

منیش ووتم : هەرچی لەتوانام داهەبێ بۆتی جێ بەجێ دەکەم ،

ووتی : من تاوەکو ئەمڕۆ ژیانێکی بێ سەروبەریم بەڕێکردووە، لە ئەمڕۆوە دەمەوێ یارمەتیم بدەی کەدەست لەخێزانم هەلگرم و تەڵاقی بدەم ،

ووتم : ئەم کارە لەبەرچی ئەنجام دەدەی ؟

ووتی : من بۆیە ئەو کچە پوورەم خواست، بۆئەوەی ئارامی ی بەماڵەوە ببەخشم، ئێستاش بەهۆی گیرانی من پشێوی کەوتۆتە ماڵەوەمان، وە نامەوێ خێزانم لەوە زیاتر بەد بەخت بکەم، ئێستاکە خێزانم زۆر لەم حاڵە بێزارە،

هەفتانە دێتە سەردانم، لەو ڕۆژانە بەگریانەوە هات و ووتی : ئەم بەڵایە چی بوو بەسەر خوشکت و منت هێنا، تۆ لەبەرچی هیچ شتێکت بەمن نەووت ؟

تۆ چاکت دەزانی ئەگەر من بمزانیبوایە تۆ خوشکی خۆت کوشتوە هەرگیز شووم پێنەدەکردی، ئێستاش دەمەوێ دەست لەمن هەلگری و لەیەکتر جیاببینەوە، چوونکە من بەرگەی غەم و پەژارەی خانەوادەکەتان ناگرم، ئێستا پوورم بەمن ئارام نابێتەوە، بەڕاستی لەدوای گیرانی تۆ بەیەکجاری سەری لێشێواوەو ئارامی لێ هەلگیراوە، منیش ئەو چەند ساڵە بەرگەی ئەم هەموو غەم و پەژارەیە ناگرم، لەوەش دەترسم لەدوای ئازادبوونت منیش بکوژی، بۆیە داوات لێ دەکەم خۆت قسە لەگەڵ ماڵەوەتان بکەو با لەیەکتر جیاببینەوە !

ئەوبەندکراوە لەقسەکانی بەردەوام بوو دواتر ووتی : باوکم و دایکم ڕازی نین کە دەست لەخێزانی خۆم هەلگرم، ئەگەر بکرێ لەگەڵ باوکم و برایەکانم بەڕێگای تەلەفۆن قسەبکەو بەڵکو ڕازیان بکەی ، وە پێیان بڵێ : ئەگەر خۆتان هەولی جیابوونەوەی نەدەن ئەوە بەدڵنیاییەوە کوڕەکەتان لەزیندان خۆی دەکوژی .

منیش بەم شێوەیە بەڕێگای تەلەفۆن قسەم لەگەڵ باوك و برایەکانی کرد، کاتێك ئەم قسانەیان بۆ دایکی کرد هەرچەندە ئەو دایکە جەرگ سووتاوە لەگەڵ ئەوە نەبوو کوڕەکەی دەست لەخێزانی هەلگرێ، بەڵام ترسا لەوەی کەجاری دووەمیش تووشی جگەر سووتاوی ببێتەوە، بۆیە ناچاربوو ڕەزامەندی خۆی نیشان بدا کە لەیەکتر جیاببنەوە، دواتر لەیەکتر جیابونەوە .

ئەو بەندکراوە دەڵێ : من غەمی ئەوەم نی یە لەبەندیخانەم، بەڵام ڕۆژانە ویژدانم دڵ و دەروونم دەسووتێنێ بۆ ئەو خوشکە بێ تاوانەم، هەر لەهیچ و

خۆڕایی دەستم چووە کوشتنی ئەو خوشکە ڕەوشت بەرزو زیرەکەم، نەنرخی ژیانی ئەوم زانی و نەژیانی خۆم .

بەڕاستی ژیان نرخ و بەهای خۆی هەیە، بەڵام بەهۆی کارێکی خراپ ڕێزو بەهای ئەو ژیانە بەنرخەم بەفیڕۆدا، لەم دونیایە ژیانێکی بێ سەروبەرم هەیە، بەڵام نازانم ژیانی دوای مردنیشم چۆن دەبێ !

# ژیانی تاوانکاری
## (( ماڵی خۆی ویران کرد ))

لەساڵانی (٢٠٠٨) تاوەکو (٢٠١٠) بەندکراوێك لەم بەندیخانە بوو، کەسێکی زۆر ڕووخۆش بوو، حەزی لەدۆستایەتی هەموو کەسێك بوو، تێکەڵاویەکی زۆری لەگەڵ خەڵك هەبوو، بۆ دۆست و نزیکانی بەردەوام دەست لەسەر سینگ بوو، بەهەموو جۆرێك یارمەتی دۆستان و دەوروبەری خۆی دەدا، ڕۆژگارێك پێکەوە لەزیندان بەیەکەوە دادەنیشتین قسەو گفتوگۆی خۆشمان لەگەڵ یەکتر دەکرد، ڕۆژێك هەموو ڕابردووی خۆی بۆباس کردم کەپڕبوو لەگوناهوو تاوان ، وە لەنێو تاوانەکانی کەبۆی دەگێڕامەوە ئەوەبوو هەموو جۆرە ئۆتۆمبێلێکی دزرایی دەکڕییەوە، تەنانەت ئەگەر بیزانیبوایە خاوەنەکەشی کوژراوە هەرگوێ ی پێنەدەداو دەیکڕیەوە .

منیش پێم ووت : تۆ کەسێکی ئەوەندە سینگ فراوانی لەگەڵ خەڵك، بەڕاستی زۆر بە ئەمەکی، سەیرە چۆن ویژدانت ئەوە قبوڵ دەکات ئەو جۆرە ئۆتۆمبێلە بکڕیەوە، لەکاتێك کە دەزانی خاوەنەکەی لێ ی سێنراوە و کوژراوە ؟

بەزەردەخەنەوە ووتی : جاری واهەبووە لەخوارەوەی عێراق ئۆتۆمبێلم بۆهاتوە و تەنانەت جێگای شوفێریش هەمووی خوێناوی بووە، بەڵام گوێم پێ نەداوە .

ووتم : تۆ لەوەناترسی تووشی سزای خودا ببی ؟

ووتی : ئەوقسەی تۆ ئێستا دەیکەی هەمان قسەیە کە خێزانم ڕۆژانە لەماڵەوە پێ ی دەووتم .

بەهەرحاڵ ماوەیەك لەزیندان رۆژانە هەوڵم دەدا کە لەدوای ئازادبوونی، ئەوکارە قێزەونە ئەنجام نەداتەوە، ئەویش پەیمانی دا ئەگەر خودا لەم زیندانە رزگاری بکا نەگەڕێتەوە سەرتاوان و گوناه .

لەساڵی (٢٠١٠) بەرلێبووردنێك کەوت و ئازادکرا، سەرەتا کە چوو دەرەوەی بەندیخانە زۆرباش بوو، بەڵام دوای ماوەیەك دەستی لەگەڵ چەند دۆستێکی رابردووی تێکەڵ کردەوە، ئەوپەیمانەی لەزیندان دابووی لەیادی چوو .

گەڕاوە سەر هەمان خراپەکانی پێشووی، بەبۆچوونی خۆی ئەوجارەیان زۆر بەچاوکراوەیی کارەکان ئەنجام بدات و نەکەوێتەوە ژێر بڕیاری دادگاو بەندیخانە.

بەماوەیەکی کەم ئەمجارە بەشێوازێکی تر نەهامەتیەکان ڕووبەڕووی خۆی و خانەوادەکەی بوونەوە .

سەرەتا کەسێکی نزیکی خۆی لەئەندامانی خانەوادەکەی تووشی نەخۆشیەکی کوشندەبوو، کەخەڵك بەگشتی لەو جۆرە نەخۆشیە دەترسن، بەتایبەتی ئافرەتان .

ئینجا بەماوەیەکی کەم خۆی لەنێوان کێشەی دووکەسی تر کوژرا، بەشاهێدی چەند کەسێك ئەو هیچ پەیوەندیەکی بەکێشەکەوە نەبوو.

پاشان کێشەکە لەنێوان خۆیان چارەسەرکراو ئەوان ئاشت بوونەوە، کەچی هیچ شتێك لەبەرامبەر خوێنەکەی ئەو نەدرا، بەخۆڕایی خوێنی بەفیڕۆ چوو .

دوای نەمانی خۆی بەماوەیەك کوڕێکی بەهۆی ڕووداوێك گیانی لەدەست دا .

ئێستاش ئەوخانەوادەیە بەڕێزە بەهۆی خاوەنەکەیان ڕووبەڕووی چەندەها نەهامەتی تر بوونەتەوە، بەڵام وەك ڕێزێك بۆ ئەوخانەوادەیە حەزناکەم

لەوەزیاتر هیچی تر لەبارەیان بنووسم کە بەهۆی ئەوبەدبەختیەوە تووشی بوونە.

داواکارم خودای گەورە ئارامی و خێروخۆشی بۆ ئەو خانەوادە بەرێزە بگەڕێنێتەوە .

خواناسان لەدێر زەمانەوە فەرموویانە : هیچ شتێك بەئەندازەی زوڵم و نانی حەڕام، ماڵی مرۆڤ وێران ناکات .

بەندکراو ئارام لەم پارچە شیعرە دەڵێ :

**کەلەمچە درا لەدەستم، بەڵام هۆشم نەبەستراوە**
**لەزینداندا خەفەت زۆرە، بەڵام ئومێد نەبڕاوە**
**بڕۆ ئەی شیشی ژەنگاوی، دڵم قەت پێت نەلەرزاوە**
**بەناوی خالقی گەورە، سەرم هەمیشە بەرزماوە**

# سۆزێك بۆ منداڵەكانی

زیندانیەك كەخاوەن خێزانەو چەند منداڵێكە، لەگەڵ هاتنی چەژنی ڕەمەزان بەم پارچە شیعرە هەستی خۆی دەردەبڕێ و بەزەیی بەمنداڵەكانی خۆی دێتەوە .

**بەناوی خودای كەسی بێ كەسان**

**خەڵك ئازادەو منیش لەزیندان**

**دەڵێم ئەوەهات جەژنی ڕەمەزان**

**پیرۆزبێت لەگشت زیندانیەكان**

**چاوەڕێم دووشەم بێن منداڵەكان**

**بڵێن ئەوەهاتین بۆلات بابەگیان**

**بۆ بۆمان ناكڕی جلوبەرگی جوان**

**هەتاكەی ئاوا دوور دەبی لێمان**

**زۆر بەغەمباری ڕووم كردە ئاسمان**

**داوام لەخودا كرد بەقوڕگی گریان**

**ئەجاتم بدەی لەكونجی زیندان**

**بۆخاتری هەرسی جوزئی قورئان**

**هەرتۆی خالقی هەرتۆی میهرەبان**

# ووتەكانی زیندان

- پەند لەخەڵكانی تر وەرگرە، بەرلەوەی خەڵك پەند لەژیانی تۆ وەربگرن .

- ئێرە زیندانە، گۆڕستانی زیندووانە، شوێنی ئازارو غەمانە، قوتابخانەی خاوەن ژیرانە، ژووری تاقیكردنەوەی دۆست و دوژمنانە .

- زیندان فێری كردم مانای ژیان چی یە، شوێنی ئارامگرتن و شوێنی خۆڕاگریە، ئیمان پتەوتر دەكات، ئارامگای پێشینەیی یە، شوێنی پەند وەرگرتنە، كانگای بەخشندەیی یە.

- تاوانكاری، كردەی مرۆڤەكانە دووبارەبوونەوەی، پیشەی دڕەندەكانە .

- زیندان ژانە بۆ ژیان، پەندێكە لە زەمان،

غەمە بۆخاوەن دڵان، وانەیە بۆخاوەن ژیران،

چاڵە بۆكەسی كەم زان، گەشتێكە بۆدانایان،

تاقیگەیە بۆ موسوڵمانان، دەردو مەینەتە بۆ بێ دینان

بۆ گوناهكارو تۆبەكاران هەرزیندانە دەبێتە بیستان.

# ژیـــانی دیـــــــنـــــــداری

## (( ژیانی دەربەدەری ))

جاران لەنێو نەتەوەی ئیسرائیل وا باوبوو، ئەگەر بەڵاو نەهامەتی ڕوو لەزەوی و مەڕومالاتی خەڵك بكردبوایە، ئەوا هۆكارەكەیان بۆ ئەوكەسە دەگەڕاندەوە كە تاوانە گەورەكان ئەنجام دەدات، هەربۆیە ئەوكەسەیان لەشار دەربەدەر دەكرد، بۆئەوەی بەم هۆیەوە خودای گەورە بەڵاو نەهامەتیەكەیان لەسەر لاببات !

جارێكیان بەم هۆیەوە هەموویان ڕێككەوتن بەئاگاداری پێغەمبەرەكەی سەردەمی خۆیان، كەسێكی بەدكار دەربەدەربكەن .

هەرچەندە ئەوكەسە بەدكارە خۆی خستە پەنای پیاوە گەورەكانی ئەوشارە، بەڵام هیچ سوودێكی نەبوو، كەس ئامادەنەبوو پەنای بدات، هەربۆیە دەربەدەریان كردو لەشاریان دوورخستەوە، ئەوكەسەش ناچاربوو ڕێگای چۆڵایی بگرێتەبەر، چەند ڕۆژێك بەدەم ڕێگاوە دەڕۆی كەچی هیچ ئاوادانیەكی نەهاتە پێش .

ئەو چەند ڕۆژە زۆر ماندوو شەكەت بوو، برسیەتی و تێنوویەتی زۆری بۆهێنا، بەتەواوەتی پەكی كەوت و ئیتر نەیتوانی لەوە زیاتر بەڕێگاوە بڕوات، سەرباری ئەوبرسیەتی و بێ توانایی یەی تووشی نەخۆشیەكی كوشندەبوو .

چەند ڕۆژێك لەسەر زەوی كەوتبوو لەبەردەم خۆیەوە قسەی دەكردو ناڵە ناڵی دەكرد، لەكۆتایی بەم شێوەیە لەوچۆل و بیابانە گیانی سپاردو مرد .

خودای گەورە وەحی بۆ پێغەمبەرەکەیانی ناردو فەرمانی پێکرد کەخۆی و چەند پیاوێکی تر لەشارەکە بۆ ئەوشوێنە بچن کەتەرمی ئەو دەربەدەرکراوەی لێ یە، فەرمانی پێکردن بەڕێ و ڕەسمی ئاینەکەیان، تەرمی ئەوکەسە دەربەدەرکراوە کفن بکەن و بەڕێز لێ گرتنەوە بەخاکی بسپێرن !

پێغەمبەرەکەش فەرمانی بەخەڵکی شارەکە کرد، بەرەو ئەو شوێنە بکەونە ڕێ .

بەدەم ڕێگاوە خەڵکەکە پرسیاریان لەپێغەمبەرەکە دەکردو دەیان ووت : ئەوکەسە هەموو ژیانی لەگوناهو تاوان بەسەر بردووە، ئەگەر وەك خۆت دەفەرمووی مردووە ئایا ئەو ڕێزگرتنەی بۆچی یە؟ ئێمە لەسەر تاوان و گوناهی خۆی دەرمان کردووە .

پێغەمبەرەکە سڵاوی خوای لێ بێت فەرمووی : من لەلایەن خوداوە چۆن فەرمانم پێکرابێت هەروادەکەم.

دوای ئەوەی گەیشتنە شوێنەکە،

بینیان کەسەدەربەدەرکراوەکە تەرمی لەسەر زەوی کەوتووە.

ئەو فەرمانەی لەلایەن خوداوە پێیان کرابوو دەست بەجێ ئەنجامیاندا و زۆر بەڕێزەوە بەخاکیان سپارد .

دوای ماوەیەك ئەوشارە بەتەواوەتی نەهامەتیان لەسەر خۆیان و مەڕو ماڵاتیان نەماو خێرو خۆشی ڕووی تێکردنەوە .

پێغەمبەرەکە سڵاوی خودای لێ بێت، وەك خەڵکی شارەکە حەزی کرد لەم نهێنی یە تێبگات، هەربۆیە خودای گەورە وەحی بۆناردو فەرمووی : دوای

ئەوەی خەڵکی ئەوشارە بڕیاریاندا ئەوکەسە بەهۆی تاوانەکانیەوە لەنێو شار دەربەدەربکەن،ئەوکەسەش ڕێگای چۆلایی گرتەبەر، دوای برسیەتی و تێنیویەتی و نەخۆشی، ئەوکەسە لەسەر زەوی کەوتبوو ڕووی لەئاسمان بوو، لەقوڵپەی گریانی داو ووتی : خودایە ! من کەسێکی تاوانبارو بەدکارم ! هەربەم هۆیەوە لەشارەکەی خۆم دەربەدەرکراوم،

خودایە ! پەنام بۆ زۆر خەڵك برد، بەڵام کەس ئامادەنەبوو پەنام بدات و دەرگام لێ بکاتەوە ! ئێستاکەش تەنها تۆم هەیە ڕووی تێبکەم، تەنها تۆم هەیە پەنام بدەی !

خودایە ئەگەر ئەو خەڵکە بەهۆی منەوە تووشی نەهامەتی بوونە، خودایە من ئێستا لەنێویان نیم، بەڕەحمەتی خۆت دەرگای خێرو خۆشیان لێ بکەیەوە و نەهامەتیان لەسەر نەهێڵی !

خودایە !! داوات لێ دەکەم ئەم دەربەدەرکردنەم بکەیە سزای تاوانەکانم !

خودایە داوات لێ دەکەم لێم خۆش ببی !!! .

لەوکاتە ئەو بەندەیەم ئەم ووشانەی لەزاری دەردەبڕی، کاتی مردنی خۆی هات و گیانیم لێ وەرگرتەوە .

سوێند بەگەورەیی و بەخشندەیی خۆم، ئەگەر لەوکاتە ئەو بەندەیەم داوای لێ خۆشبوونی بۆ هەموو گوناهبارانی شارەکە بکردایا، من لەهەر هەموویان خۆش دەبووم .

هەم خۆی بەتۆبەکاری گەڕاوە بارەگای خودا .

هەروەها خەڵکی شارەکەش لەنەهامەتی ڕزگاریان بوو .

# ژیانی دیـــــنداری

یەکێ لەبانگخوازەکان دەگێڕێتەوە و دەڵێ یەکێ لەگەڕەکەکانی ووڵاتی میسر منداڵێکی تەمەن ١٠ ساڵانە بەناوی قەیس، خولیای دینداری بوو زۆر تامەزرۆی ئەوەبوو لەگەڵ خەڵك نوێژی بەکۆمەڵ ئەنجام بدات، بەڵام باوکی پیاوێکی خوانەناس و مەیخۆر بوو، قبوڵی نەدەکرد قەیسی کوڕی بچێت بۆنوێژی بەیانی بۆمزگەوت، ئەو باوکە دڵ ڕەق و خوانەناسە چەند جارێك هەڕەشەی لەقەیس کرد، دەیووت : هەر بەیانیەك بەتاریکی بچیە مزگەوت نابێ بگەڕێیتەوە ئەم ماڵە، قەیس دەگریا لەباوکی دەپاڕایەوە، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو، قەیس ناچاربوو ڕۆژێکیان لەدوای نوێژی عەسر ئەم باسە لەگەڵ عومەر موستەفا بکاتەوە، پیاوێکی بەتەمەن و خواناسێکی دراوسێ یان بوو .

عومەر موستەفا ووتی : باوکت کەسێکی خوانەناسە، من ناتوانم ئەم داوایەی لێ بکەم.

قەیس زۆر بێ ئوومێدبوو، بیری لەوەدەکردەوە هەموو بەیانیەك دەرگایەکە بەئارامی و بەبێ دەنگی بکاتەوەو بۆ نوێژی بەیانی بڕوات، سوپاس بۆ خودا هەموو بەیانیەك دوعای دەکرد خودا لەشەڕی باوکی بیپارێزێت، لەگەڵ بانگی بەیانی بەئارامی دەرگای ماڵەوەی دەکردەوەو زۆر بەڕێزەوە لەدوای عومەر موستەفا بەرەو مزگەوت دەڕۆی .

ماوەیەك قەیس بەم شێوەیە لەنوێژی بەیانی لەمزگەوت ئامادەبوو، ئەو ڕۆژەی عومەر موستەفای بەتەمەن و خواناس کۆچی دوایی کرد، هیچ کەسێك بە ئەندازەی قەیسی تەمەن بچووك غەمبار نەبوو، لەماڵەوە زۆر دەگریا، گریانی قەیس زۆر کاریگەری لەسەر باوکی نواند، باوکی بەزەیی پێهاتەوەو

دەستی لەملی قەیس کردو ووتی : کوڕی خۆم ئەم هەموو گریان و غەم و پەژارەیە چیە بەرۆکی تۆی گرتوە . ؟

قەیسی تەمەن بچووکیش بەدەم گریانەوە ووتی : مام عومەر موستەفای دراوسێمان .

دایکی قەیس نهێنیەکەی ئاشکرا کردو ووتی : قەیس بەمردنی ئەو لەنوێژی بەیانی بێ ئومێد بوو، چوونکە تۆ ڕێگای نوێژت لێ گرتووە، بەڵام عومەر موستەفای دراوسێمان بەیانیان لەگەڵ خۆی بۆ مزگەوتی دەبرد .

باوکی زۆر بەزەیی بە قەیس هاتەوە، هەر ئەو کوڕە بچووکەی بووە هۆی ئەوەی هیدایەت و ڕاستە ڕێ بوونی، سەری قەیسی ماچ کردو ووتی : کوڕی خۆم لەبەیانیەوە خۆم بۆ مزگەوتت دەبەم و منیش وەك تۆ نوێژ دەکەم .

سوپاس بۆ خودا ئەو باوکە بووبە کەسێکی خواناس، بەردەوام لەگەڵ قەیسی کوڕی هەر پێنج نوێژەکانی لەمزگەوت ئەنجام دەدەن .

# ووتەکانی (ڕۆح)

ـ تەنها نوێژە پەیوەندی نێوان بەندەو خوا دروست و پتەو دەکات، ئایا ئەو کەسەی بیست و سێ کاتژمێری شەوو ڕۆژ بۆ ئەم دونیایە کورت و کەم خایەنە تەرخان دەکات و تاکە کات ژمێرێکیش بۆ ژیانی نەبڕاوە و هەمیشەیی تەرخان ناکات، چەندە ستەم لەخۆی دەکات، کارێکی دوور لەئەقڵ ئەنجام دەدات .

ـ لەکاتی سوجدەبردن بۆیە سەرت بەم شێوە دادەنوێنی، بۆئەوەی بەتەنها ملت بۆخودا کەچ بکەی.

ـ پەرستنی خودا وەك قومارکردن نی یە کە بەئەنجامدانی دۆڕاندنی تێدابێت، بەدڵنیاییەوە بە ئەنجامدانی سەرکەوتوو دەبێ و نەکردنیشی هەر دۆڕاندنە .

ـ دەسکەوتە مەزنەکانی ڕۆژی دوایی بەپەرستنی خودا بەدەست دێ .

چەند نهێنیەك لەپێنج نوێژەکە : ـ

نوێژی بەیانی : لەدایك بوون و چاوکردنەوەت بەڕووی ژیان بەیاد دێنێتەوە، چوونکە ئەوکاتە بێداربوونەتە لەخەو نیگا کردنتە بەڕووی دونیا .

تۆ ئەم شەو وەك مردوویەك بووی، بەڵام خودا گیانەکەی بۆگەڕاندیەوە بۆیە دەبێ بەدوورکاعەت نوێژی بەیانی، سوپاسگوزاری خودای پەروەردگار بکەی .

نوێژی نیوەڕۆ : کاتی لاویەتیت بەیاد دێنێتەوە کە خودا بەنیعمەتەکانی خۆی دەوری تەنیوی، ئەوکاتە کاتی خۆراك و خواردن و ژەمی نیوڕۆیە بۆیە دەبێ بەچوار ڕکاعەتی نوێژی نیوەڕۆ سوپاسگوزاری خودای ڕۆژیدەر بکەی .

نوێژی عەسر: کاتی پیرو پەکەوتووبیت بەیاد دێنێتەوە کە بەپشتیوانی خودا تەمەنت بەئەمڕۆ گەیشت، وە ئەوکاتەش کاتی کارکردن و مامەڵەکردنێکی بەحەڵاڵی یە، هەربۆیە دەبێ بەچوار ڕکاعەتی نوێژی عەسر سوپاسگوزاری خودا بکەی .

نوێژی مەغریب : مردنت بەیاد دێنێتەوە کە ڕۆژی تەمەنت ئاوابوو، وە بەیادت دێنێتەوە ئەمڕۆ چەندەها کەس وەفاتی کردوە نەگەڕایەوە ماڵەوە و ماڵئاوایی لەژیانی کردوە کەچی تۆ بەسەلامەتی گەڕایەوە ماڵەوە، بۆیە دەبێ بەسێ ڕکاعەتی نوێژی مەغریب سوپاسگوزاری خودا بکەی .

نوێژی عیشا : تەنگ و تاریکی نێو گۆڕت بەیاد دێنێتەوە، ئەو تاریکیەی ژێر زەویت بەیاد دێنێتەوە کەلە چاوەڕوانی تۆ دایە، وە بەیادت دێنێتەوە کە ئەو کاتەکانی حەوانەوەتە لەنێو خانەوادەکەت، هەربۆیە بەچوار ڕکاعەتی نوێژی عیشا دەبێ سوپاسگوزاری خودای بەخشندەو میهرەبان بکەی .

وە شەونوێژ : بەرەو لیقای پاشای هەموو جیهانت دەبات و ڕۆژی حەشرو لێپرسینەوەت دێنێتەوە یاد، بۆیە هەوڵبدە بەچارێکە کات ژمێرێکیش بەر لەبانگی بەیانی خۆت لەو میواندارییە پیرۆزە بێ بەش مەکە .

کەواتە لەنێوان ئەو پێنج نوێژە تەمەن و ژیانی خۆت بەهەموو قۆناغەکانیەوە دێتەوە یاد .

وەحی هات بۆپێغەمبەر شوعەیب (علیه الصلاة والسلام) خوای گەورە پێ ی فەرموو: (ئەی شوعەیب دڵی خۆت بۆمن پڕ ترس بکە، مل کەچی خۆت بۆمن نیشان بدە، چاوەکانت بۆمن پڕ فرمێسك بکە، ئینجا داوام لێ بکە و منیش لێتەوە نزیکم).

- زاهید ئەوکەسە نیە، کەهیچ شتێکی نیە، بەڵکو زاهید ئەوکەسەیە کە هیچ شتێك نابێتە خاوەنی ئەو .

- مرۆڤ خاوەنی ڕۆح نیە، بەڵکو مرۆڤ خودی خۆی ڕۆحە، تۆ ڕۆحێکی لەگەڵ جەستەیەکدای، نەك جەستەیەك لەگەڵ ڕۆحێکدا.

- ئەوەی ئێمە ناومان لێناوە ((ژیان)) بەهیچ شێوەیەك ((ژیان)) نی یە، بەڵکو ڕۆیشتنێکە بۆپیربوون و نزیك بوونەوەیە لە وێستگەی مەرگ، ژیانی ڕاستەقینە ئەوەیە لەڕۆحی خۆمان تێبگەین و بزانین چی لەئێمە دەوێ .

- خواناسێکی پێشوو فەرموویەتی : من لەخەودا چەند دوعایەکم کرد، دەنگێکی خۆش و پیرۆز، بەم شێوەیە وەڵامی دەدامەوە .

ووتم : خودایە ! یارمەتیم بدە خووە ناشرینەکانم واز لێبهێنم !

ئەو فەرمووی: خۆت دەبێ وازیان لێبهێنی، منیش یارمەتیت دەدەم ،

ووتم : خودایە ! خۆشبەختم بکە !

ئەو فەرمووی : نیعمەت لەمن، خۆشبەختی لەخۆت ،

ووتم : خودایە ! تووشی ئازارو مەینەتم مەکە !

ئەو فەرمووی : ئازارو مەینەتەکان لەغرووری و لەخۆبایی بوون بەدوورت دەگرن و لەمنت نزیك دەکەنەوە ،

ووتم : خودایە ! شیفای کوڕەکەم ئەندامەکەم بدە !

ئەو فەرمووی : جەستەو بەدەن کاتی نیە، گرینگ ئەوەیە ڕۆحی سەلامەتە ،

ووتم : خودایە ! گەشە بە ڕۆحم بدە !

ئەو فەرمووی : دەبێ خۆت گەشە بکەیت، من تەنها لق و درەختەکان گەشە پێ دەدەم ،

ووتم : خودایە ! هەر ئەوەندە یارمەتیم بدە کە بتوانم چێژ لەپەرستنی تۆو ژیانی خۆم وەرگرم !

ئەو فەرمووی : منیش هەر بۆ ئەم مەبەستە تۆم خوڵقاند .

- مەلائیکەتەکان لەدەرگای بەهەشت دەچنە ژوورەوە، شەیتانەکانیش تەنها دەتوانن لەدەرگای دۆزەخ بچنە ژوورەوە، بەڵام تۆی مرۆڤ دەتوانی لەهەردوو دەرگا بچیە ژوورەوە .

- ووشترە ترسناکەکە، بۆهەڵگرتنی هەمووومان، لەبەر دەرگای ماڵی هەموو کەسێك پاڵ دەکەوێت. (مەبەست لە ووشترە ترسناکەکە) واتە : دارە مەیت .

- مرۆڤ بەدرێژایی تەمەنی لەزەوی دەخوات، بەڵام زەوی تەنها جارێك مرۆڤ دەخوات .

- کاتێك مرۆڤێکی بێ باوەڕ لەڕۆژی حەشر لەبەردەم دادگای خودا ڕادەگیرێت، ئەوکات لەترسی سزای خودا، ڕۆح و جەستەی مرۆڤە بێ باوەڕەکە، دەبێتە دەمەقاڵیان، ڕۆح دەڵێ: خودایە ! من ئەو ڕۆحە بووم کە بەپاکی لەلای تۆ بووم، نەمدەتوانی هیچ کارێکی خراپ ئەنجام بدەم، دواتر منت خستە نێو ئەم جەستە تاوانبارە و تووشی خراپەو تاوان بووم.

بەهەمان شێوە جەستە دێتە قسەکردن و بەڵگەهێنانەوە،

جەستە دەڵێ : خودایە ! من پەیکەرێکی بێ گیان بووم، هیچ هەستێکم نەبوو بۆ بیستن و بینین، منیش نەمدەتوانی هیچ تاوانێك ئەنجام بدەم، ئەگەر ئەم ڕۆحەت نەخستبوایە نێو من، من نەمدەتوانی هەنگاوێك بۆپێشەوە بڕۆم، دواتر ئەم ڕۆحە تاوانبارەت خستە نێو من و منیش تووشی خراپەو تاوان بووم.

خودا بە هەردووکیان دەفەرمووێ : ئێوە هەردووکتان هاوبەش بوون لەخراپەو تاوانەکان، بۆیە دەبێ هەردوکتان سزا بدرێن .

ئینجا هەردووکیان دەبنەوە مرۆڤە بێ باوەڕەکەو ڕاپێچی نێو دۆزەخی دەکەن .

- جارێکیان ڕۆح و مردن، بووبە دەمەقاڵیان :

ڕۆح ووتی : ئەی مردن ! تۆ چیت لەمن دەوێ ؟

مردن ووتی : دەمەوێ تۆ بۆخۆم ببەم

ڕۆح ووتی : من کراسێکم هەیە بەناوی ((جەستە)) ئامادەم ئەوکراسەت پێ بدەم، هەرکاتێك ئەو کراسەت بۆخۆت برد، هەرگیز ناتوانی من بۆخۆت ببەی، چوونکە ئەوکات من دەگەڕێمەوە بۆبارەگای خودا .

# ژیانی شەڕو ئاشتی

سودابەخان دەگێڕێتەوە و دەڵێ : ڕازیـەخانی دایکی ((خوسـرەو)ی مێـردم، ئـافرەتێکی دەروون پـاك و لێوبەخەنـدە و خـۆڕاگرو ئـارامگربوو، دڵـی وەك دڵـی منـداڵی بـچووك بـوو، تۆسـقاڵێك ڕق و کینـەی لـەدڵ هەڵنـە دەگـرت، ئـافرەتێکی دیندارو قسەخۆش بـوو، کاتێـك لەگـەڵ (خوسـرەو) ژیـانی هاوسـەرگیریمان پێـك هێنا، هەرلەگەڵ ڕازیەخانی دایکی خوسرەو لەخانووەکەی خۆی پێکەوە ژیانمـان بەسەر دەبرد .

ڕازیـــەخان زۆر ڕێـــزی لـــەمن دەگـــرت، بەزەردەخەنـــەوە بـــەمنی دەووت : کـــە لەتەمەنی تۆ بووم منیش بەبووکینی لەگوندەکەی خۆمانەوە چوومە ماڵی باوك و بـاپیری خوســـرەو، بەڕەحمـــەت بـــێ داپـــیرەی خوســـرەو بـــەمنی دەووت : بـــە ئەندازەی کچەکانی خۆم تۆم خۆش دەوێت و لـەتۆ ڕازیـم، بەئومێـدی ئـەوەم تـۆ لەدوارۆژ بووکت بێتە ماڵەوەت و لەژێر سێبەری بحەسێیتەوە.

بەڵام دڵ ڕەقی وەك من کاتێـك گـوێم لـەم جـۆرە قـسانە دەبـوو، زۆر گـرینگیم پێنەدەدا، تەنها بەقسەیەکی سەر لێوانم دەزانـی، بـەڵام مـن بـەدوای بەهانەیـەك دەگـەڕام کەئـەو جێبهـێڵین و بـچینە نێـو خـانووی سـەربەخۆ، کاتێـك لەگـەڵ خوسرەو ئەوباسـەم کـردەوە، ئـەو ووتـی : سـودابەخان دایکـم پـەیمانی پێـدام تـا لەسەر پێ ی خۆی وەسـتابێ بەهەمـوو جۆرێـك خزمـەتمان بکـات، خـۆت ڕۆژانـە دەبینی هەموو کارێکی ماڵەوە ئەو ئەنجامی دەدات، هەرچەنـدە مـن کـوڕی ئـەوم، بەڵام ڕێزێکی تایبەت و زیاتر لەتۆ ئەگرێ، ئێستاش سـوپاس بۆخـودا لەهیـچمان کەم نی یە.

بەڵام من سووربووم لەسەر قسەی خۆم کە دەبێ لەدایکی جیابینەوە .

هەستم کرد خوسرەو گوێ ی بەوداوایەم نادات، منیش لەڕقان ڕۆژانە دەستم کرد بەتوانج لێدان و قسەی ناشرین بەدایکی، بەڵام ئەو زۆر بەئارامی یەوە دەیووت : کچی خۆم ووریابە شەیتان زاڵ نەبێ بەسەرت .

بەڕاستی زۆر سەیربوو ئەو ئافرەتە بەتەمەنە لەگەڵ ئەو هەموو قسە ناشرینانەی من ، ئەو هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو، ڕۆژێك گوێم لێ نەبوو قسەیەکی ناشرین لەبەرامبەرم بکات، هەروەها هیچ قسەیەکی بۆ خوسرەوی کوڕی نەدەگێڕایەوە، ئارامگرتن و خۆڕاگری ئەو ڕادەبەدەربوو، زۆر ووشەی تەسبیحات و سەڵاواتی لەسەر لێوی بوو، جار جاریش دەستی بۆئاسمان بەرزدەکردەوە لەخودا دەپاڕایەوە و بەدەم پاڕانەوە دەیووت : خودایە شەڕو ئاشووب لەعێراق و ئێران نەهێڵی ! خودایە بە لوتف و بەخشندەیی خۆت ئەم شەڕو کوشتارە ڕاگری، چیتر موسڵمانانی هەردوولا نەبنە قوربانی خواستەکانی ئیسرائیل و دۆستەکانی !

لەکاتی پاڕانەوەدا زۆرجاران خۆی پێ نەدەوەستا لەقوڵپەی گریانی دەدا، بۆ ئەو خانەوادانەی کە تەرمی ڕۆڵەکانیان لەبەرەی جەنگ دەهێنرایەوە، چەند دڵی بۆ ئەوان دەسووتا، جاری وا هەبوو هەندێ لەدراوسێیەکانمان بەدڵخۆشیەوە دەیان ووت : ئەمجارە سەربازێکی زۆر لەعێراقیەکان کوژراون، ئەویش زۆر بەناڕەحەتیەوە وەڵامی دەدانەوە و دەیووت : توخوا بەکوشتنی کەس دڵخۆش مەبن ئەوانیش هەر موسڵمانن، بەڵام ناچارکراون کە لەبەرەی جەنگ ئامادەبن بۆ شەڕکردن، بۆیە ئەوانیش دایك و باوکیان هەنەو بەچوونەوەی تەرمی ڕۆڵەکانیان ناڵەو گریانیان بەرزی ئاسمان دەبێتەوە، ئێوە لەجیاتی ئەوەی

خۆشحالّی بۆکوشتنی ئەو سەربازە ناچارکراوانە دەربڕن، لەخودا بپاڕێنەوە خودا ئەو شەڕو ئاژاوە لەنێو موسوڵمانان نەهێڵێت .

سەیرم دەکرد ڕازیەخان هەر لەماڵەوەی خۆی تا دەگاتە هەموو ووڵات بەگشتی حەز بە ئاشتی و ئارامی دەکات، وە ئامۆژگاری ئەوکەسانەشی دەکرد کە حەز بەجەنگ و شەڕو کوشتار دەکەن .

منیش لەماڵەوە بەهانەم پێ دەگرت، ئەویش بە پێچەوانەی من زۆر بەنەرم و نیانی هەڵس و کەوتی لەگەڵ من دەکرد، هەستم دەکرد شەڕکردنم لەگەڵ ئەو لەدۆڕاندن زیاتر هیچیترم بۆنامێنێتەوە .

ڕۆژێکیان لەبەردەم ڕازیەخان بەخوسرەوم ووت : من دەمەوێ سەربەخۆ بژین و چیتر لەم خانووە نەمێنین !

خوسرەو ووتی : سودابەخان تکات لێ دەکەم ئەم بیرۆکە لەمێشکت دەربێنە خۆ ئێمە لەهیچمان کەم نی یە، بۆچی وادەکەی ؟

ڕازیەخان بەزەردەخەنەوە سەیری هەردووکمانی کردو ووتی : هەرچەندە من زۆر خۆشحاڵم کە لەم ماڵە لەگەڵ من ژیان بەسەر دەبەن، بەڵام ئەگەر ئێوە خۆتان حەزناکەن لەگەڵ من بژین، ئێوە بۆخۆتان سەربەستن چۆنتان پێ خۆشە وابکەن، چوونکە ئەگەر زۆریتان لێ بکەم لەگەڵ من بمێننەوە ئەوکات وەك کەسانی ژێر دەستە ژیان بەسەر دەبەن، منیش نامەوێ بەم شێوە ژیان بەسەر ببەن .

خوسرەو ووتی : دایەگیان من ناتوانم بەبێ تۆ لەهیچ شوێنێکی تر ژیان بەسەر ببەم، سودابەخان جارجار قسەی وادەکات بەڵام دڵنیابە هەر لەگەڵ تۆ دەمێنینەوە .

سودابەخان ووتی : منیش ناچاربووم بێ دەنگ بم هەروەك جارانی پێشوو لەخواستەکەم سەرکەوتوو نەبووم .

ئەوماوەیە بەهۆی ئەوەی کە منالێکم لەسك بوو ئیتر ئەوخواستەم لەیادچوو، بەڵام لەهەمان کاتدا ئەوماوەیە ڕازیەخان زۆر بەمنەوە ماندووبوو، بەردەوام چاودێری دەکردم، زۆر گرینگی پێدەدام و بەردەوام پارێزگاری دەکردم، بەووتەی شیرین و قسەخۆشەکانی، غەم و بێ توانایی لەیاد دەبردمەوە. جارجار دەستی ڕاستی لەسەر نێوچاوانی دادەنام و ئایەتی قورئانی لەسەر دەخوێندم و دواتر تەسبیحات و سەڵاوات و دوعای لەسەر دەخوێندم .

بەڕاستی ئارامیەکی تەواوی بەدڵ و گیان و جەستەم بەخشیبوو، تەنها بە ووشەی (کچی خۆم) بانگی دەکردم ئای چ دڵێکی فراوان و زوبانێکی شیرینی هەبوو، لەدوای ئەوەی کەمنداڵەکەم هاتە دونیا ووتی : خۆم ناو لەم کوڕە دەنێم، ناوی نا (سەلام) بەئومێدی ئەوەی لەدوای لەدایك بوونی ئەم منداڵە ئاشتی و سەلامەتی باڵ بکێشێتە سەرهەردوو ووڵاتی ئێران و عێراق و کۆتایی بەو شەڕو کوشتارە بێت .

هەروەها لەشێوازی بەخێوکردن و پاراستنی منداڵ، ڕێنماییەکی ووردی بۆ دەکردم، ڕۆژانە بەدیار خۆم و سەلامی کوڕمەوە بوو، دڵنیام ئەگەر لەگەڵ دایکی خۆشم بوومایە بەم شێوەیە گرینگی پێنەدەدام .

ڕازیەخان بەم هەڵس و کەوتە میهرەبانیەی خۆی متمانەی هەموو دەورو دراوسێ ی خۆی بەدەست هێنابوو، دەورودراوسێ و ئافرەتانی گەڕەکەکەمان لەزۆر شت پرس و ڕاوێژیان بەئەو دەکرد، هەروەها ڕۆڵێکی کارامەی هەبوو لەپرسەو سەرەخۆشی و دڵدانەوەی غەمباران و لێقەوماوان، ئەگەر لەنێو گەڕەکەکەمان لەنێو دووخانەوادە شەڕو ئاژاوە دروست بوایە ئەو خۆی دەگەیاندە نێوان هەردوو خانەوادە، هەتاکوو ئاشتی نەکردبونایەوە نەدەهاتەوە ماڵەوە، هەروەها لەکاتی پرسەو سەرەخۆشی دڵنەوایی خانەوادە مردووەکەی بەشێوەیەك دەکرد وەك ئەوەی کەسیان لێ نەمردبێت، لەپرسەکان کاریگەریەکی تەواوی لەسەر ئافرەتان هەبوو دەیووت : ووشەی نابەجێ دەرنەبڕن کە ببێتە هۆی تووڕەبوونی خوای گەورە و ئازاردانی مردووەکە !

بەڵام ئەوەی لەیادمە جارێکیان تەرمی سەربازێکی گەڕەکەکەمان لەبەرەی جەنگ هێنرایەوە بۆ گەڕەك، ئەویش لەگەڵ هاتنەوەی تەرمەکە خۆی گەیاندە ماڵی سەربازەکە، بەمەبەستی ئەوەی دڵنەواییان بکات، تەرمەکە لەحەوشەی ماڵەکە دانرابوو کەس و کاری بەدەوریەوە ناڵەو گریانیان دەکرد، ڕازیەخانیش دڵنەوایی دەکردن، لەپڕێك چاوی بە یەکێ لەمنداڵی کوژراوەکە کەوت کەتەمەنی تەنها چوار ساڵانەبوو، لەلای سەری باوکی دانیشتبوو سەری باوکی ماچ دەکرد و دەیووت : باوکە بۆ لەخەو هەڵناستی ؟

ڕازیەخان چاوی بەم دیمەنە کەوت لەجێگای خۆی بوورایەوە، لەنزیکی تەرمەکە کەوتە سەر زەوی و لەهۆش خۆی چوو، دەست بەجێ بەئۆتۆمبێلێك گەیاندیانە نەخۆشخانە و خەریك بوو تووشی وەستانی دڵ بێت، من لەماڵەوە هەستم بەتەنیاییەکی گەلێك زۆر دەکرد، بەگریانەوە لەخوا دەپاڕامەوە تەنها

ئەوجارە ڕازیەخان بەسەلامەتی بگەڕێتەوەماڵەوە! پەیمان دەدەم دەست لەشەڕو دەمەقاڵێ هەلگرم و بەتەواوەتی لەگەڵی ئاشت ببمەوە .

ئینجا زانیم من بەرامبەر بەو ئافرەتە بەڕێزو میهرەبانـە چ کەسـێکی دڵ ڕەق و بـێ وویـژدانم، هەرچـی وویـست و خواسـتم هەیـە هیـچم لـەدڵی نـەما، تـەنها ئەوەی ئاواتی گەورەی من بوو سەلامەتی ڕازیەخان و هاتنەوەی بوو بۆماڵەوە .

سوپاس بۆ خودا ئەوماوەیە پزیشکەکان لەنەخۆشخانە گرینگیـەکی تایبـەتیان بەڕازیـەخان دابـوو، ئینجـا لەسـەر فـەرمانی پزیـشك بەسـەلامەتی هێنرایـەوە ماڵەوە، تەنها توانیم بەگریانەوە شان و دەستەکانی ماچ بکەم بە پەرۆشـەوە دەم ووت : ڕازیـەخان توخـوا بمبـوورە! مـن لەبەرامبـەر تـۆ زۆر شـەرمەزارم ئـەویش بەزەردەخەنەوە دەیووت : هەموو شەڕێك ئاشتی بەدواوەیە، خۆزگە بەم زووانـە ئێران و عێراقیش ئاشـت ببونایـەوە و کۆتـایی بـەم هـەموو کوشـتارە بەهاتایـە،! ئەوکات گیانیش بسپێرم و بمرم بەدڵنیاییەوە بەئاسوودەیی دەمرم.

بینیم بەگریانەوە دەستی بۆئاسمان بـەرزکردەوە دەیـووت : خودایـە! خودایـە! بەمیهرەبانی خۆت کۆتایی بەو شەڕو خوێناویە بهێنـە! چیتر منداڵانی هـەردوولا بێ باوك نەکرێن، خودایە ئەو شەڕە تەنها لەبەرژەوەندی شەیتان و دۆسـتەکانی دایە، کۆتایی بەو کوشتارە بێنە کەتەنها موسڵمانان خوێنیان بەفیڕۆ دەڕوات !!

ئـیتر لـەوەزیاتر نـەیتوانی ووشـەی تـر دەربڕێـت، بەگریانـەوە دەسـتی بـەرەو ئاسمان ڕاگرتبوو ئێمەش بەدەوریەوە دڵنەواییمان کردو ووتمان: ڕازیەخان ئـارام بەوە، دڵنیابە نزاو پاڕانەوەکەت گیرا دەبێ .

تەنها دوومانگ دوای ئەم نزاو پاڕانەوەی ڕازیەخان، لەڕاگەیاندنەکان موژدەی وەستانی شەڕی نێوان ئێران و عێراق ڕاگەیێنرا، لەهەموو لایەك بووە چەژن و شادی، دەست بەجێ موژدەی هاتنەوەی دیلەکان لەڕاگەیاندنەکان بڵاوکرایەوە، ڕازیە خانم بینی لەحەوشیماڵەوە سوژدەی شوکرانەی بۆ خوا برد، سەری بەزەویەوە بوو لەخۆشیان دەگریا، نزیکەی نیوکاتژمێربوو سەری بەرزنەدەکردەوەو وەك لێزمەی باران فرمێسکی شادی هەڵدەوەراند .

ئای خودایە بڕواناکەم هیچ ڕۆژێکم بینیبێ لەژیانم کە بەئەندازەی ئەو ڕۆژە خۆشتربێ .

ڕازیەخان دەیووت : ئەگەر مرۆڤەکان بزانن چ خۆشیەك لەئاشتی هەیە، بەدڵنیاییەوە کەس پەنا بۆ شەڕو جەنگ نابات .

بڕیاریدا پارەیەکی زۆر بۆ قوربانیدان تەرخان بکات، خێرو بێرەکەی بەسەر خەڵکی گەڕەکەکەمان دابەش بکات.

ئەو هیواو ئاواتەی ڕازیەخان هاتەدی بەڵام چ هیواو ئاواتێك، بەڕاستی ئەو هیواو ئاواتە بۆ هەموو موسڵمانان خێرو خۆشی بوو .

حەوت مانگ دوای ئاشت بوونەوەی ئێران و عێراق، لەساڵی (١٩٨٩) ڕازیەخان گیانی سپاردو بەئاسوودەیی بەرەو ژیانی دوای مردن ڕۆیشت و هەنگاوی نا .

بەڕاستی مردنی ڕازیەخان هەموو گەڕەکی هەژاند، تەنانەت لە ڕاگەیاندنەکانیش هەواڵی مردنی ڕازیەخان بڵاوکرایەوە .

مردنی ئەو بۆمن گەورەترین کارەسات و نەهامەتی ژیانم بوو، ئەگەر ئەوکات خوسرەوی پیاوم و سەلامی کوڕم و دایك و باوکی خۆم گیانیان سپاردبووایە، بێ

گومان  بە ئەنـدازەی مردنـی ڕازیـەخان غـەمبار نـەدەبووم، بەڕاسـتی ڕازیـەخان بەنەرم و نیانی خۆی ئاشتی بۆماڵەوە گەڕانـدەوە، وەبـەنزاو پاڕانـەوەکان ئاشـتی بۆ هـەردوو وولـات گەڕانـدەوە، بەڕاسـتی ڕازیـەخان بـەو خـوو ڕەوشـتە بـەرزەی، منی فێری ژیانی پڕ لەخۆشەویستی و تەبایی و میهرەبانی کرد .

# ووتەکانی ((دڵ))

رازو مرازەکانی دڵ :

دڵەکەت چەند داوایەکی لێت هەیە، کە بۆی جێ بەجێ بکەی،

دڵەکەت پێت دەڵێ : ئەگەر ئەم داوایانەم بۆجێ بەجێ بکەی، من و تۆ بەیەکەوە ئاسوودە دەبین، داوایەکان ئەمانەن :

ئەوەی منی لەنێو سینگی تۆ بەدیهێنا، بەشێوەیەك بیپەرستە کە هیچ کەسێك بەم شێوەیە نەیپەرستبێت ،

رێگای راست بەشێوەیەك بگرەبەر، کە هیچ کەس بەم شێوەیە ئەم رێگایەی نەگرتبێتەبەر

ئەوەندە فرمێسك بۆخۆت برێژە، کە تاکوو ئێستا هیچ کەسێ بەم شێوەیە بۆخۆی نەگریابێ

ئارامیەك بەخۆت و دەوروبەرت ببەخشە، کە تاکو ئێستا هیچ کەسێ تام و چێژی ئەم جۆرە ئارامیەی نەکردبێ

لەسەر رابردووت لێپرسینەوەیەك لەگەڵ خۆت بکە، کە تائێستا هیچ کەس بەم شێوەیە لێپرسینەوەی لەگەڵ خۆی نەکردبێت

ئەگەر یەکێك لەم داوایانەم جێ بەجێ بکەی لەژیانی خۆت، ئەوا بەدڵنیاییەوە لەدونیاو رۆژی دوایی سەربەرزو سەرفراز دەبی، ئەگەر ئەم داوایانەشم

فەرامۆش بکەی، ئەوە هەم خۆت و هەروەها منیش بەدبەخت و ماڵ وێران دەکەی .

ـ هەلگرتنی ڕق و کینە، سەرەتا دڵی خۆتی پێ بریندار دەکەی، ئینجا خەڵکانی تری پێ ئازار دەدەی .

ـ یەکێ لەدوعایەکانی خواناسانی پێشوو، کە هەموو بەیانیەك دەیان ووت :

خودایە ! ڕق و کینە لە دڵم دەربهێنە .

**ـ سێ شتن ئەوانەی مرۆڤ کامڵ دەکەن :**

**یەکەم :** زاڵ بێت بەسەر ڕەوشت و کەسایەتی خۆی .

**دووەم :** قسەکانی هەڵسەنگێنێ و ئینجا دەریببڕێ .

**سێ یەم :** بەئەندازەیەك نان بخوا کە زیانی بەخۆی نەگەینێ .

**ـ سێ شت هەن کەس لێیان سەلامەت نابێ :**

**یەکەم :** دۆستایەتی کردنی دەسەڵاتدارو نزیك بوون لەپاشا.

**دووەم :** نهێنی درکاندن لەلای ئافرەت .

**سێ یەم :** خورادنی ژەهر بۆتاقی کردنەوە .

ـ زەمانە بەشێکە لەچارەسەر، هەر میوەیەك نەگەیشتبێتە کاتی گەیینی، بێ گومان بەلێکردنەوەی پەشیمانی بەدوادێت، چوونکە هەم تاڵە و بەکەلکی خواردن نایەت، وەهەم ناتوانی بەجێگای خۆی بلکێنیەوە .

ـ درۆ وەك بەفرە هەرچەندی غلۆری کەیەوە گەورەتر دەبێ، بەڵام زووش ئەتوێتەوە .

ـ نەکەی شەڕ لەگەڵ ویست و خواستی خودا بکەیت، چوونکە هەر ویستی خودایە لەسەرووی ڕۆژگار .

ـ پەنجەرەی گەورە بەبەردێکی بچووك دەشکێت .

ـ دڵداری درۆیینە، مرۆڤی ئاسایی دەکات بەشاعیر، شاعیریش دەکات بەشێت، شێتیش دەکات بەئاژەڵ .

ـ لەنێو گوڵی ترسەوە، گوڵی ئاشتیت دەست دەکەوێ .

ـ دۆڕانەکانی مرۆڤ لەبێ ئاگایی خۆیەوە سەرچاوە ئەگرێ .

ـ ڕۆژ دەڵێ : من ڕۆژێکی نوێم شایەتم لەسەر کارەکانت، چاکترە سوودم لێ ببینی، چوونکە کە ڕۆیشتم تا ڕۆژی دوایی ناگەڕێمەوە .

ـ ناپلیۆن دەڵێ : ئەوەندە شکستم خوارد، تا ڕێگەی شکست دان فێربووم .

ـ کاتێك لێ نەگەڕێین ڕۆژ لەپەنجەرە بێتە ژوورەوە، دەبێ پزیشك لەدەرگاوە بێتە ژوورەوە .

ـ ئەی ئافرەت ئەگەر ناتوانی لەئاسمان ببی بەئەستێرە، لەماڵەوە ببە بەچرا .

ـ ژنان جوان بوونیان پێ باشترە لەچاك بوون، نەزانی ئەوان لەوەدایە کە ئەگەر چاك ببن جوانیش دەبن .

ـ سەگ دەوڕێت و کەچی کاروانیش هەر تێپەڕ دەبێ .

ـ ڕۆژوو خۆری زستان وەك زڕدایكە، دەدرەوشێتەوە، بەڵام گەرمایی نی یە .

ـ دەست پێ نەکردن باشترە لەتەواو نەکردن .

ـ کەمێکی بەردەوام چاکترە لەزۆرێکی پچڕاو .

ـ قەڵەمی زوبان دەبێ لەمەرەکەبی دڵ ڕابکرێت .

ـ قەرز زنجیرێکی دیلیە کە بەدەستی خۆمان لەملی دەکەین.

ـ ڕاستی دەتوانی بۆماوەیەك خواری بکەیەوە، بەڵام ناتوانی بیشکێنی .

ـ بە ووشتری پیر، پێستی ووشتری گەنج بۆبازاڕ دەبەن .

ـ لەژیانی دونیا موجامەلەکردن زۆرە، بەڵام هیچ پاساوێك نی یە بۆ شاردنەوەی حەق و ڕاستی .

ـ ئومێدو بەهیوابوون بۆ ژیانی مرۆڤ، بەئەندازەی باڵ بۆ باڵندە گرنگی هەیە
ـ ئومێدو هیوابوون لە ڕەزووباغی ئیمانەوە سەردەردەهێنێ.

# ڕۆژی چوارەم

# گەشتێك بۆ

# کۆشکی پاشاو کونی مار

# ژیانی ڕاستگۆیی
## ((هەتا توانیم هەوڵی خۆمدا))

یەکێ لەکوڕە پاشایەکانی پێشوو، وویستی وابوو خوازبێنی کچێك بکات، کە ئەوکچە ڕاستگۆبێت لەژیان، ئەگەرچی کچە هەژارێکی ووڵاتەکەیانیش بێت، هەربۆ ئەم مەبەستە ڕاوێژی بەوەزیرێکی خۆیان کرد، کە ئەو وەزیرە زۆر هۆشمەندو دانابوو.

وەزیرەکە بۆئەوەی ئەم خواستەی کوڕی پاشا بێنێتەدی، بۆ ئەم مەبەستە پلانێکی دارشت، کە لەوپلانە تەنها خۆی و کوڕی پاشا ئاگاداربوون، تەنانەت کەسانی نێو کۆشکیش ئاگاداری نهێنی نێو ئەم پلانە نەبوون .

بەیانی لەنێو کۆڵانەکانی ووڵات لەلایەن هەندێ لەپیاوانی پاشا بانگهێشتی کچان کرا، لەکۆڵانەکان دەیان ووت : هەرکچێك ئامادەیە شوو بەکوڕی پاشا بکات، با بۆ بەیانی لەکۆشك ئامادەبێت !

بۆ بەیانیەکەی هەموو کچە وەزیرو کچە دەوڵەمەندەکان لەکۆشك ئامادەبوون، لەنێو ئەو هەموو کچانە کچە هەژارێك لەنێو هەمووان بەدی دەکرا،

هەرچەندە ئەوکچە هەژارە لەلایەن دایکیەوە زۆر ئامۆژگاری کرا، کە خۆ نەخاتە نێو ئەم جۆرە داوایانە، بەڵام کچەکە بەدایکی ووتبوو : هەرنەبێ بۆخۆم گەشتێك بەنێو کۆشکی پاشا دەکەم و لەنزیکەوە خانەوادەکەی پاشا دەبینم .

ئەو ڕۆژە لەنێو کۆشك هەموو کچەکان بەڕێزەوە وەستابوون، وەزیر هاتە بەرامبەریان.

ووتی : هەرکچێك لەئێوە قووتی گوڵدانێك و مشتێ تۆ گوڵی پێدەدەین، دەبێ هەریەك لەئێوە لەقوتوەکەی خۆی ئەو مشتە تۆ گوڵە بچێنێت، ئینجا دوای سێ مانگ هەمووتان لەم شوێنە ئامادەببنەوە، ئێمەش لەلایەن خۆمانەوە سەیری یەکە یەکە قوتوە گوڵەکانتان دەکەین، ئەوکات قوتوە گوڵی هەرکچێك بەدڵی ئێمە بێت، ئەوە بەفەرمی ئەوکچە دەکەین بەهاوسەری ڕاستەقینەی کوڕی پاشا.

ئەو ڕۆژەی هەموو کچەکان هەریەکەو بەقوتوو مشتێ تۆی گوڵ لەنێو کۆشك هاتنە دەرەوەو بەرەوماڵەکانیان چوونەوە.

((ئەو قوتویەی گوڵی لەنێو دەچێنن لەکوردەواری پێ ی دەووترێ مەرکان)) .

لەو ماوەیە هەموویان خەریکی ڕواندنی گوڵەکانی خۆیان بوون، کچە هەژارەکەش وەك ئەوان بەجۆش و خرۆشەوە کارەکەی ئەنجام دەدا، زۆربەجوانی خزمەتی قوتوەکەی دەکرد.

سەرەتا گوڵەکان زۆر بەجوانی سەریان دەرهێنا، کچە هەژارەکە زۆر دڵی خۆش بوو هەستی کرد لەئاواتەکەی نزیك بۆتەوە، بۆیە زۆر گرینگی بەپاراستنی گوڵەکان دەدا، بەڵام لەپڕێك گوڵەکان سست بوونەوە،

کچە هەژارەکە زۆر هەوڵی دا گوڵەکان لەم حاڵە ڕزگار بکات، بەڵام هەوڵەکەی هیچ سوودێکی نەبوو، گوڵەکان بەتەواوەتی پووکانەوە .

تەنها چەند ڕۆژێك مابوو سێ مانگەکە تەواو ببێت، کەچی گوڵەکان بەم شێوەیە مانەوە، ئەو شەوەی کە بەیانی یەکەی دەبوایە لەکۆشك ئامادەبن، کچە هەژارەکە ووتی : بەیانی بەم گوڵە پووکانەوە ئامادە دەبم .

دایکی ووتی : کچی خۆم من لەسەرەتا بەتۆم ووت : خانەوادەیەکی هەژاری وەك ئێمە ناتوانێ خۆبخاتە نێو ئەم جۆرە کارانە، تۆچۆن بەم گوڵە سست و ووشکانە دەچیە نێو کۆشکی پاشا ؟

کچەکەش وەڵامی دایکی دایەوە ووتی : من چۆن لەسەرەتاوە چوومە نێو ئەم کارەو سێ مانگ هەوڵی خۆمدا، دەبێ بەیانیش بەهەر جۆرێك بێت ئامادەی نێو کۆشکی پاشا ببم .

بۆبەیانی ئەوکچە هەژارە هەروەك کچانی تر لەکۆشك ئامادەبوو، کچە وەزیرو دەوڵەمەندەکان جوانترین جل و بەرگی گرانبەها یان پۆشیبوو، هەر یەکێکیان قوتوە گوڵەکانیان لەبەردەم خۆیان دانابوو، گوڵەکانیان جوانترین دیمەنی بەکۆشك بەخشیبوو، تەنها کچە هەژارەکە نەبێ جل و بەرگێکی سادەی پۆشیبوو، قوتوە گوڵە پووکاوەکانی لەبەردەم خۆی دانابوو .

هەموو کچەکانی تر بەپێکەنینەوە سەیریان دەکرد، هەریەکەو بەجۆرێك بەقسەی نابەجێ سووکایەتیان بەجل و بەرگی کچە هەژارەکەو گوڵە پووکاوەکانی دەکرد، ئەویش بێ ئەوەی هیچ وەڵامێکی ئەوان بداتەوە، تەنها سەیری گوڵە پووکاوەکانی خۆی دەکرد .

لەوکاتە کوڕە پاشاو وەزیر هاتنە بەرامبەر کچەکان، ئەوان بەڕێز وەستابوون و هەریەکەو قوتوە گوڵەکانی خۆی لەبەردەم خۆی دانابوو .

کوڕە پاشاو وەزیر، یەکە یەکە سەیری قوتوە گوڵەکانیان دەکرد تا گەیشتنە بەرامبەر قوتوی کچە هەژارەکە، وەزیر ڕووی لە کچە هەژارەکە کردو ووتی : گوڵەکانی تۆ بۆ وایان بەسەر هاتووە ؟

کچە هەژارەکە، ووتی : من ئەو سێ مانگە هەتا توانیم هەوڵی خۆمدا، هەرچەندە گوڵەکان سەریان دەرهێنا، بەڵام دواتر سست بوون و پووکانەوە .

کچەکان هەموویان لەقاقای پێکەنینیاندا.

وەزیر ووتی : تۆ بۆچی تۆی گوڵی ترت بەکارنەهێنا ؟

کچە هەژارەکە ووتی : لەبەر ئەوەی تۆ ووتت : ئەم تۆ گوڵانە بچێنن، بۆیە من نەمتوانی تۆی گوڵی تر بەکاربێنم .

لەوکاتە کوڕە پاشاو وەزیر هەردووکیان بەزەردەخەنەوە سەیری کچە هەژارەکەیان کردو وەزیرەکە لەنێو کۆشك بەدەنگێکی گەورە ووتی : هەموو کچە وەزیرو دەوڵەمەندەکان فێریان لەقوتوە گوڵەکانی خۆیان کردووە، چوونکە ئەوتۆ گوڵانەی لەئێمە وەریان گرتبوو، هەمووی پووچ بوو، ئەگەرچی ئەوگوڵانە سەریان دەردێنن، بەڵام بەهۆی پووچی تۆیەکەیانەوە زوو دەپووکێنەوە، بۆیە ئەوان لەدوای پووکانەوەی گوڵەکانیان، تۆی گوڵی تریان بەکارهێناوە، بەڵام تەنها ئەوکچە ڕاستگۆیەو کارەکەی بەڕاست و دروستی ئەنجامداوە، ئێستاکەش ئەوکچە بەفەرمی لەکوڕی پاشا مارە دەکەین، لەبەر ئەوەی کوڕی پاشامان مەبەستی بوو، کچێکی ڕاستگۆ بخوازێ، ئێستاکەش خواستەکەی هاتەدی .

هەرچی لەنێو کۆشك بوو بەدەنگی گەورە پیرۆزباییان لە کچە هەژارەکە کردو تەنها کچە وەزیرو دەوڵەمەندەکان نەبێ سەریان نزم کرد و بەسستی کۆشکیان بەجێ هێشت .

کچە هەژارەکەش بووە هاوسەری ڕاستەقینەی کوڕی پاشا .

# ژیانی وەفاداری
# گەر نمەکی کردی لێ ی دڵنیابە

جارێکیان پیاوێك چوو بۆلای کەسێکی شارەزاو دانـا، ووتـی: ئێمـە لەماڵـەوە زۆر نارەحـەتین لەبەرئـەوەی مـارێکی ژەهـراوی لـەنێو مـاڵی ئێمەدایـە، شـەوانە دێتـە دەرەوە، کاتێـك پـێ ی دەزانـین هـەوڵ دەدەیـن بیکـوژین، بـەڵام هەرلـەنێو ماڵەکەی خۆمان خۆی دەخاتـە نێـو کونێـك، هەرلـەم کونـەوە دەچێتە ژێـرەوەی خانوەکـەمان، بەڕاسـتی تووشـی تـرس و دڵـەڕاوکێ ی کـردووین و نـازانم چـۆن لەناوی ببەین ؟

پیـاوە دانایەکـە بـەخاوەن ماڵەکـەی ووت : ئەگـەر چـوویەوە ماڵـەوە هێلکەیەك بکوڵێنە و پاشان پەلکەکەی لێکەوە و هەندێك نمەك واتە خوێ بخە نێو هێلکە کوڵایەکە، ئینجا لەبەردەم کونەکە داینێ و تا مارەکە بۆنی دەکات و دەیخـوات، کـەخواردی دڵنیابـە مـادەم نمـەکی ئێـوەی کـرد بـەهیچ شـێوەیەك ئازارتـان نـادات، لەبـەر ئـەوەی ئـەو هێلکـەو ئـەو خـوێ یـەی لەبەرچاوە و هـیچ ئازارتان پێ ناگەینێ،

کاتێك خـاوەن ماڵەکـە گەڕایـەوە ماڵەوە، ئامۆژگـاری پیـاوە دانایەکـەی جـێ بـەجێ کـردو کارەکـەی ئـەنجام دا، خـاوەن ماڵەکـە ووتـی : کاتێـك شـەو داهـات، مارەکە خۆی لەهێلکەکە نزیك کردەوە دەمێك زاری لەسەر ڕاگرت و پاشان قوتی داو دووبارە لەکونەکەوە بەرەو ژێری خانووەکـەمان چـوو، چـەند شـەوو ڕۆژێـك لەنێو کونەکـە نەهاتـە دەرەوە، لـەناکاو شـەوێکیان هاتـە دەرەوە،دەسـت بـەجێ و بەسەلامەتی لەماڵەکەمان چووە دەرەوەو بەرەو چۆلایی خشی و ڕۆیشت .

# ووتەکانی ((زێڕین))

خـودای گـەورە دەفـەرمووێ : ((بـا مرۆڤـ سـەیری خواردنەکـەی بکـات و سەرنجی بدات)) .

هەندێ لەخاوەن تەفسیرەگان فەرموویانە((واتە بیر لەو شیرە بکەوە کە یەکـەم خۆراکت بووە)).

دانایەکان ووتوویانە : ـ

ـ من تۆم فێری مەلەکرد، کەچی تۆش دەتەوێ بمخنکێنی .

ـ وەفاداری لەپەیمانی ڕاست و ئەمانەت پارێزی خۆی نزیك دەکاتەوە .

ـ ئەگەر ویـستت خـۆت لەگـەڵ دوژمنەکـەت ئاشت بکەیـەوە، ووریابـە دۆسـتی دوێنێت، نەکەی بەقوربانی ئەو .

ـ وەفادار وەك خەڵکانی تر دڵی خۆشە کە قەرز وەردەگرێ، بەڵام ئەوکات دڵـی خۆشـترە کـە قەرزەکـە بەخاوەنەکـەی دەداتـەوە، وەخـاوەن ماڵەکـەی لـەلا خۆشەویستر دەبێ .

ــ بەخیانـەت کـردن تۆڵـەی خـۆت مەسـێنەوە، چـوونکە خیانـەتکردن تیـشکی وەفاداری خامۆش دەکات.

ـ ئەگەر خوێت بەکارهێنا ئاگاداربە خێدانەکە مەشکێنە، وە ئەو دارەی مەبڕە کە لەژێر سێبەرەکەی حەوایەوە، وە ئەوکەسە بەکەم مەزانە کە ڕێزت ئەگرێ .

ـ وەفا چاکەو دەروون پاکی پاشەکەوت دەکات .

ـ چاکەکردن لەگەڵ کەسی بێ وەفا، وەك ڕشتنی گوڵاوە لەدەریا .

ـ لەووتنی ڕاستیەکان، بڕۆ نێو، لانەی شێرەکان .

- ووتنی ڕاستی سەختە، بەڵام کە ڕاستیت ووت ئەوکات دەبی بەسوارچاکێکی کارامە .

- ڕاستگۆیی، واتە : بترسەو بلەرزە، بەڵام تەنها یەك هەنگاو بڕۆ پێش .

- درۆکردن نەخۆشی یە، دەرمانی چارەسەرەکەشی تەنها ڕاستگۆیی یە .

- کچ لەماڵی هەژار بخوازە و ئەسپ لەماڵی دەوڵەمەند بکڕە.

- تاجی پاشا لەزێڕە، تاجی کچیش لە ئەدەبە .

# ژیانی ناتەبایی و خیانەتکاری
## ((دوژمنایەتی من و خراپەکانی ئەو))

هەرچەندە ئەم بەسەرهاتە هەندێ ترسناکە، بەڵام مەبەست تێیدا پەند وەرگرتنە.

((کارمێن)) دەگێڕێتەوەو دەڵێ : ـ پیاوەکەم ناوی ((جۆن)بوو سەرەتا زۆرم خۆش دەویست، ژیانێکی زۆر خۆشمان لەگەڵ یەکتر بەسەر دەبرد، بەڵام هەستم کرد وورده وورده خۆشەویستی نێوانمان بەرەو کەمی دەچوو، ئێمە لەباڵاخانەیەك لەنهۆمی ((دوو)) ژیانمان بەسەر دەبرد، وە لەڕووی ماددیەوە حاڵمان باش بوو، هەرچەندە پیاوەکەم کارێکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام من فەرمانبەر بووم، خاوەن مووچەیەکی چاك بووم دەمان توانی بەباشی پێ ی بەڕێوەبچین، لەناخی خۆمەوە زۆر ئاسوودە دەبووم کە ئەوکاتەی بۆکارەکەی خۆم دەڕۆیشتم، چوونکە لەپیاوەکەم دوور دەبووم، بەشێوەیەك هەڵس و کەوتم لەگەڵ پیاوەکەم دەکرد، بێ ئومێدم دەکرد لەدۆستایەتی خۆم، بۆیە هەندێ جار بەمنی دەووت : (کارمێن) تۆبۆچی بەم شێوە دوژمنایەتی من دەکەی ؟

بەڵام من هیچ وەڵامێکی ئەو قسەیەی ئەوم نەدەدایەوە، هەستم کرد تەواو لەدۆستایەتی من بێ ئومێد بووە، هەر بەم حاڵە ڕۆژێکیان لەکاری فەرمانبەری خۆم بووم، هەستم کرد ژانە سەرێکی زۆربەتینم گرت، هەربۆیە ڕوخسەتم لەبەڕێوەبەرەکەمان وەرگرت و بەرەو ماڵەوە گەڕامەوە، کاتێك چوومەوە نێو باڵاخانەکەو لەبەر دەرگای ماڵەوەی خۆمان وەستام، بەرلەوەی دەرگای ماڵەوە بکەمەوە، لەماڵەوەمان دەنگی خەڵکم دەبیست، بەتەواوی گوێم ڕاگرت، یەکێ

لەدەنگەکان دەنگی (جۆن) ی پیاوەکەم بوو، ئەوی تریش دەنگی ئافرەتێك بوو، هەستم کرد دەنگی ئافرەتەکەش بەلامەوە ئاشنایە، بەڵام هەر نەم زانی ئافرەتەکە کێ یە، هەرچەندە من حاڵم باش نەبوو، بەڵام دەست بەجێ گەڕامەوەو لەدوورەوەی ماڵەوە لەشوێنێك وەستام و خۆم شاردەوە، بەو بێ حاڵیەم ئارامم گرت و بەووردی چاودێری دەرگای ماڵەوەی خۆمان کرد، پاش کەمێك بینیم، ئافرەتێکی دراوسێ ی خۆمان بەخەندەو شادیەوە لەماڵەوەمان هاتەدەرەوەو بۆ نهۆمی خۆیان چوەوە، ئەم ئافرەتەش (لیندا)) بوو، منیش بەچەند دەنکە حەبێك تانیوەڕۆ لەسەر شەقام خۆم ڕاگرت، پاشان وەك ڕۆژانی پێشوو لەکاتی تەواو بوونی کارەکەم چوومەوە ماڵەوە، دوای سڵاو ئەحواڵ پرسین پیاوەکەشم ووتی : منیش تازە لەکاری خۆم تەواو بوومەو هاتوومەوە،

منیش ئەو ڕۆژە تاکاتی ئێوارەکە خۆم لەم بارەیەوە بێ دەنگ کرد، لەبەرئەوەی دەم ویست هەلێکم بۆ برەخسێ کارێکی وای پێ بکەم ئاگری ڕق و کینەی نێو دڵم بکوژێنمەوە، بەهۆی ئەوەی دەستی لەگەڵ ((لیندا)) تێکەڵ کردبوو، دەم توانی بەم هۆیەوە دەست لەپیاوەکەم هەڵگرم و جیا ببمەوە، بەڵام حەزم دەکرد هەردووکیان لەناو ببەم،

ئێوارەکەی ئەو ڕۆژە پیاوەکەم دەستی کرد بە مەی خواردنەوە بینیم سەرخۆش بوو، دەستی کرد بەقسەی پێکەنیناوی و گاڵتەو گەپ، منیش چوومە چێشتخانەکە چەقۆیەکم بەشاراوەیی هەڵگرت و چوومە لای (جۆن) و پرسیارم لێکرد، ووتم : ئەمڕۆ بەیانیەکەی لەماڵەوەمان کێ میوانت بوو ؟

پیاوەکەم بەسەرخۆشی و پێکەنینەوە ووتی : کەس میوانم نەبوو .

ووتم : لیندای دراوسێمان ئەمڕۆ میوانی تۆ بووە و لەگەڵ ئەو چیت دەکرد ؟

ئەویش ووتی : کارمێن ئەگەر تۆ دژایەتی من نەکەی من بۆچی لیندا دەکەم بەدۆستی خۆم ؟

منیش هەناسەیەکم کێشا ووتم : ئەو دۆستەت پیرۆزبێ، ئەویش پاڵ کەوتبوو بەپێکەنینەوە لەبەردەم خۆی قسەیەکی کرد.

منیش چوومە لای سەری وەستام هەتا هێزم تێدابوو چەقۆیەکەم بەرزکردەوە دەست بەجێ لە کەللەی سەریم داو بینیم چەقۆیەکە بەتەواوەتی چووە نێو سەری، تەنها دەسکەکەی لەدەرەوەی سەری لەنێو دەستم بوو، بینیم (جۆن) لەجێگای خۆی دەنگێکی گەورەی لێ هات و دەستی کرد بە پەڵەقاژەکردن، لەژوورەکە بەپاڵکەوتن هەڵدەپەڕی تابینیم جولەی نەماو گیانی دەرچوو، ئینجا دەستم کرد بەپارچەپارچەکردنی لاشەکەی، هەندێ لەگۆشتەکەیم جیاکردەوە بە مەبەستی لێنان بۆخواردن، ئینجا سەرو دەست و قاچەکانی و بەشەکەی تری لاشەکە، خستمە نێو کیسەیەکی ڕەش و گەورە، زبڵی ماڵەوەشم خستە نێو کیسەکە، پاشان کیسەکەم هەڵگرت و خستمە نێو زبڵدانی باڵاخانەکەو لەژێر زبڵ شاردمەوە.

ئینجا گۆشتی پیاوەکەم لەمەکینەداو کردمە قیمە، لەنێو ساردخانە هەڵم گرت و بەیانی نەچووم بۆ سەرکارەکەم، تەنها چووم هەندێ سەوزەوات و پێداویستی ماڵەوەم کڕی، پاشان چوومە لای (لیندا) ی دراوسێمان، دوای ئەحواڵ پرسین ووتم: (جۆن) ی پیاوەکەم ئەم شەو هەواڵی مردنی باوکیان پێگەیاند، ئەو ڕۆیشت من بەتەنیا ماومەوە لەبەرئەوەی من لەدوێنێ وە نەخۆشم نەم توانی لەگەڵ (جۆن) بۆ ماڵی باوکی بڕۆم و نەشم توانی بۆسەرکارەکەشم بڕۆم، تەنها

چووم ڕوخسەتم لەبەڕێوەبەرەکەمان وەرگرت، پێم ووت: هەم نەخۆشم و وە هەروەها پیاوەکەشم باوکی مردووە.

جۆن پێ ی ووتم : ئەگەر نەت توانی بۆ مالی باوکم بێ ی بڕۆ مالی لیندای دراوسێمان.

((ليندا)) زۆر خۆشحالْ بوو هەرچەندە داوای کرد لەلای بمێنمەوە، بەلام من داوام لە ئەوکرد ووتم : تۆ وەرە بۆ مالی ئێمە لەبەرئەوەی خواردن و هەموو شتێکمان لەمالەوە ئامادەیە.

(ليندا) بەخۆشحالیەوە لەگەلم هاتە مالەوە .

ووتی : غەم مەخۆ تۆ تەنها نی .

کاتێك چووینە مالەوە، ووتم تۆ دانیشە ئێستا قیمەکە سوور دەکەمەوەو لەگەلْ سەوزەوات دەیخۆین، (ليندا) خۆی بەپاك کردنەوەی سەوزەواتەکە خەریك کردو منیش گۆشتی لاشەی پیاوەکەم لەساردخانە دەرهێناو بەهارات و دەرمانی خواردنم پێ داکردو دەستم کرد بە سوورکردنەوەی.

دوای ئەوەی خواردنەکەم ئامادەکرد(ليندا) مێزەکەی بەسەوزەوات و شتی تر ڕازاندەوە.

منیش خواردنەکەم هێنایە سەر مێزەکەو هەردووکمان لەبەرامبەر یەکتر دانیشتین و دەستمان بەخواردن کرد، من زۆر بەئاسایی گۆشتی قیمەکەم دەخوارد، بەلام بینیم (ليندا) دلی بۆ خواردنی گۆشتەکە نەدەچوو، بۆیە لەشەرمان لوقمەنانی زۆر بچووکی دەکردو کەمێکی لەقیمەکە تێدەکرد، بەلام زیاتر خۆی بەخواردنی سەوزەو میوە خەریك دەکرد، بینیم سەرو دلی تێك

چوو، ووتی : کارمێن ئەم قیمە گۆشتە بۆنێکی زۆرناخۆشی هەیە وابزانم ئەم گۆشتە کاتی بەسەرچووە و تێك چووە، تکات لێ دەکەم مەخۆ !

منیش هەستام و ووتم دەچم خواردنێکی تر دەهێنم، بەپەلە چوومە چێشتخانە چەقۆیەکم هێناو کە هاتمە ژوورەوە ئەو پشتی لەڕووی من بوو، ووتم خواردنم بۆهێناى ،

ئەویش ووتی : کارمێن ئەوەچۆن ئەم خواردنەت پێدەخورێ ؟ منیش چەقۆیەکم لەسەر ملی دانا و ووتم ئەگەر من بتوانم دوژمنی خۆم بخۆم ، تۆ بۆ ناتوانی دۆستی خۆت بخۆی ؟ ئەزانی ئەو قیمەیە گۆشتی لاشەی ئەو دۆستەی تۆیە کە دوێنێ لەگەڵ یەکتر ڕاتان دەبواردو گاڵتەو قاقای پێکەنینتان دەکرد، دەبێ تۆش بخۆم و بچیە نێو گەدەی من و لەگەڵ دۆستەکەت بەیەکترتان شاد بکەمەوەو گەدەی من ببێتە گۆڕی هەردووکتان.

بەرلەوەی چەقۆیەکە بەملی (لیندا) دابێنم و سەری ببڕم، بینیم لیندا لەترسان شلەژاو لەسەر کورسیەکە کەوتەخوارەوە و لەهۆش خۆی چوو.

ئینجا سەری ئەویشم بڕی و بەهەمان شێوە پارچەپارچەم کردو کەمێکیش لەگۆشتی لاشەکەی ئەوم سوور کردەوە و خواردم، چەند ڕۆژێك لەماڵەوە بەتەنهابووم تووشی نەخۆشی دەروونی بووم، خەڵکی نێو باڵاخانەکەمان هەستیان بەبۆنی گەنیو دەکردو پۆلیسیان ئاگادارکردەوە و منیان بەرەو لای پزیشکی دەروونی بردو پاش چارەسەرکردنم بۆ زیندانیان بردم، ئێستا لەبەندیخانەم و بیر لەڕۆژانی ڕابردووم دەکەمەوە دان بەوە دادەنێم کە من دژایەتی پیاوەکەم بەخۆڕایی و بێ سوودبوو، هەر ئەم دوژمنایەتیە بوو، پیاوەکەمی لەدۆستایەتی خۆم بێ ئومێدکرد، بۆیە پەنای بۆ لیندا برد، بۆئەوەی

لەدۆستایەتی کردنی ئەوجێگای من بگرێتەوە، ئێستاش ڕۆژانە نەفرەت لەم جۆرە دوژمنایەتیە دەکەم، کەمنی کردە دڕندەترین مرۆڤ ، من نەم زانیوە دڕندە دڕندەیەکی تر بخوات، بەڵام منی مرۆڤ، بووم بە دڕندەیەکی ترسناك و توانیم مرۆڤ بخۆم و تۆسقاڵێك سۆزو ویژدان لەدڵم نەمێنێ، ئێستاش ئەوەندە لەژیان بێزارم خۆزگە بۆ ئەوساتە دەخوازم کە گیانمی تێدا دەسپێرم .

# ووتەکانی ((تاڵ))

داناکان ووتوویانە : ـ

ـ با هەزار دوژمنت لەدەرەوەی ماڵەوەت هەبێ، بەڵام تاکە دوژمنێکت لەماڵەوە نەبێ.

ـ زۆرتر لەوکەسە وریابە کە لەمەودوا دەبێتە دوژمنت لەکاتێك لەپێشوودا چاکەت لەگەڵی کردووە .

ـ دوژمنی خۆت بەگورگ بزانە نەك مەڕ.

ـ خراپترین دوژمنت ئەودۆستەیە کەلێت هەڵدەگەڕێتەوەو دەبێ بەدوژمنت.

ـ دژایەتی کردنی نزیکەکانت زۆر سەختە.

ـ ببە بەمەڕ گورگ دەبینی.

ـ خۆشحاڵبوون بەشکستی دوژمن بەشێوەیەك لەدڵ هەڵدەقوڵێن، وەك ئەم کانیەیە کە لەپڕێك لەزەوی دەردەچێت و هەڵدەقوڵێ .

ـ ئەگەر دوژمنەکەت ڕێگای هەڵەو خراپی گرتەبەر، وازی لێ بێنەو ڕاستی مەکەوە.

ـ دڵنیابە دوژمنەکەت بەهیچ شێوەیەك مەدحت ناکات، ئەگەر مەدحیشی کردی، چاك بزانە بەرژەوەندیەکی تایبەت بەخۆی تێدایە.

- پێکەنینی زۆردارەکان فێڵاوی و دوژمنایەتیە، نەتبینیوە دڕەندەکانیش کاتێك دەمیان دەکەنەوە ئەڵێ ی پێدەکەنن.

- ئەوەی بەقسەی دوژمن دەسخەڕۆبێت، بێگومان دوژمنی گیانی خۆیتی .

- گەورەترین تاوانی ژن و مێرد خیانەت کردنە لەیەکتر، هەربۆیە بەرسزای خودا دەکەون و لەنێو خەڵکیش ڕیسوا دەبن .

- ترسنۆکترین کەس مرۆڤی خیانەتکارە، گەر سەرۆکیش بێ، چوونکە گومان لەدارو دەستەکەشی دەکات .

- خیانەت پەردەی شەرم و حەیا دادەماڵێت .

- دوژمنێك کە بەئاشکرا دژایەتیت دەکا، چاکترە لەودۆستەی کە ژێراو ژێر دژایەتیت دەکات.

- دوژمن ئەگەر هیچ ڕێگای بۆفرت و فێڵ نەمێنێ، پاش هەموو ڕێگایەکان زنجیری دۆستایەتی دەجولێنێ .

- هەندێ کەس لەبەرئەوەی دژایەتی تۆدەکەن، چوونکە تیشکی تۆ عەیب و کەم و کوڕیەکانی ئەو بەدەردەخات.

- دەبێ بزانی لەدوای شەیتان خراپترین دوژمنت کردەوە خراپەکانتە.

- ئەوانەی دوژمنی سەرسەختیان هەیە، بێ گومان پێغەمبەران و بڕوادارانی ڕاستەقینەن .

ـ دوژمنەکەت بەکەم مەزانە، هەرمێشوولەیە خەو لەچاوی شێر دەزڕێنێ .

ـ کردەوەو ڕەفتاری دوژمن گلەیی و گازندەی ناوێ .

ـ سەد دوژمنی خوێن مژ، باشترە لە ژنێکی بێ دین و بێ حەیا .

ـ لەلێکۆڵینەوەیەك کە لەلایەن هەندێ لەدەروونناسەکان ئەنجامدراوە، بۆیان دەرکەوت کە ئەوکەسانەی مەی دەخۆنەوەو ماددە هۆشبەرەکان بەکاردێنن، ئەوکەسانە هیچ ئامانجێکیان بۆ دواڕۆژیان نی یە، هەربۆیە خۆیان لەژیان و ئامانجەکانی بێ ئاگا دەکەن .

ـ شەیتان بۆ تۆڵە سەندنەوەی خۆی دژایەتی ئێمە دەکات، چوونکە ئەو ڕۆژەی باوکە ئادەم دروست کرا، شەیتان نەفرەتی لێ کراو لەلای خودا هیچ ڕێزێکی نەما، بۆیە دەبێ ووریای خۆمان بین، لەبەرامبەر ئەو دوژمنە نەفرەت لێکراوو بێ ڕێزە .

# ئەم موڵکە مافی ئەوانە

لە وولاتی هیندستان دوو هۆز لەشارۆچکەیەك ژیان بەسەر دەبەن، یەکێ لەو دوو هۆزانە خەڵکەکەی موسڵمانن و لەسەر داب و نەریتی ئاینی ئیسلامن،

هۆزەکەی تریش ئاینێکی تایبەت بەخۆیان هەیە، هەر لەدێر زەمانەوە ئەم دوو هۆزو تیرەیە لەگەڵ یەکتر ژیان بەسەر دەبەن، جارجار تووڕەیی و قسە پێ گوتن دەکەوێتە نێوانیان، ئەویش بەهۆی ئەوەیە هەندێ جار ئافرەتانی هۆزەکەی تر دەبن بەموسڵمان و خۆیان دەگەیننە گەورەی هۆزی موسڵمانەکان و هەرلەوێ ئافرەتەکان لەسەر خواستی خۆیان شوو بەلاوانی نێو هۆزی موسڵمانەکان دەکەن .

بەڵام جارێکیان هەڵاو ئاژاوەیەك دەکەوێتە نێوانی ئەو دووهۆزە، ئەویش بەهۆی پارچە زەویەك کە هەریەك لەو دوو هۆزانە، ئەو پارچە زەوی یەیان بەحەق و موڵکی خۆیان دەزانی .

هیچ کام لەو دووهۆزانە ئامادەنەبوون چاوپۆش لەو پارچە زەوی یە بکەن بۆ ئەوی تر .

بەڵام ئەگەر بە حەق و مافیش بوایە، ئەو پارچە زەوی یە موڵکی هۆزە موسڵمانەکە نەبوو، بەڵکو هەر لەدێر زەمانەوە ئەو پارچە زەوی یە موڵکی باوباپیرانی هۆزەکەی تربوو، هەر بەم هۆیەوە بوو، ئەو هۆزە داوای لەهۆزی موسوڵمانەکان کرد ئەم کێشەیە ببەن بۆ دادگای ئەو شارۆچکەیە، لەوکات هۆزی موسڵمانەکان ووتیان : ئێمە نامانەوێ کێشەکە بچێتە دادگا، بەڵام دڵنیاتان

دەکەینەوە ئەم پارچە زەوی یە لەنێو خۆمان نایکەین بەموڵکی هیچ کەسێك بەڵکو دەیکەینە مزگەوت و ماڵی خودا،

بەڵام خەڵکی هۆزەکەی تر سووربوون لەسەر ئەوەی ئەم کێشەیە بچێت بۆ دادگا، بۆیە پەنایان بۆدادگای شارۆچکەکەبرد، کاتێك کێشەکە چووە بەردەم دادوەر، لەڕێگای دادگاوە سەلێنرا ئەو پارچە زەوی یە موڵکی هۆزەکەی ترە، دادوەر بەڕاشکاوی ڕایگەیاند و بەتایبەتی ڕووی لەهۆزی موسوڵمانەکان کردو ووتی : ئەو پارچە زەوی یە موڵکی ئێوەنیە، بەبەڵگەی یاسایی موڵکی ئەوانی ترە،

بەڵام خەڵکانی هۆزە موسڵمانەکە گوێیان بەقسەی دادوەر نەداو بەدادوەریان ووت : ئەو پارچە زەوی یە ماوەیەکی زۆرە لەدەستی خۆمانە، ئێستاش بۆخۆمان دەیکەین بەمزگەوت و ماڵی خودا. دادوەرەکە چەندی هەوڵی دا نەیتوانی موسوڵمانەکان بێ دەنگ بکات، بەهەر حاڵ بیری لەڕێگایەکی تر کردەوە، کە بتوانێ بەنەرم و نیانی و بێ کێشەو ئاژاوە کۆتایی بەم کێشەیە بێنێ، هەربۆیە دادوەرەکە ڕووی لەپیاوانی هۆزە موسوڵمانەکە کردو ووتی : ئەوکەسەی لەنێو ئێوە شارەزای لەئاینی ئیسلام هەیەو بەزانای خۆتانی دەزانن، حەزدەکەم هەندێك لەئێوە بڕۆن و بانگهێشتی زاناکەی خۆتان بکەن و با تەشریفی بۆئێرە بێنێت !

هۆزی موسڵمانان ئەم داوایەی دادوەریان زۆر بەدڵ بوو زۆر خۆشحاڵ بوون، هەربۆیە دەست بەجێ هەندێکیان بە پەلە چوون زاناکەیان لەگەڵ خۆیان بۆ دادگا هێنا،

دادوەر لەنێو هۆڵی دادگا بەڕێزەوە بەرەو ڕووی زاناکە چوو پێشوازی لێ کرد. دادوەرەکە بەتێرو تەسەلی کێشەی زەویەکەی بۆ زاناکە باس کرد، بەهەمان شێوە لەبەرامبەر زاناکە بەبەڵگە سەلماندی کە ئەو پارچە زەوی یە موڵکی هۆزەکەی ترە،

کاتێك زاناکە بەتەواوەتی لەمەسەلەکە تێگەیشت، هەناسەیەکی کێشاو ڕووی لەخەڵکی هۆزەکەی خۆی کرد ووتی: ئەم موڵکە مافی ئەوانە، ئێستا ئێوە چیتان دەوێ ؟

ئەوانیش وەڵامیان داوەو ووتیان : ئێمە لەسەر ئەو پارچە زەوی یە مزگەوتێکی گەورەو فراوان دروست دەکەین ،

زاناکە ووتی : نەتان زانیوە خودا فەرموویەتی ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْ ۚ ٱعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ ﴾ المائدە،٨

واتە : (( ئەی بڕواداران بەچاکی و دادپەروەرانە شایەدی بۆ خودا ئەنجام بدەن و ڕق و کینەو دوژمنایەتی هیچ لایەك واتان لێ نەکات لەدادپەروەری لابدەن، حەق ویست و دادپەروەربن، ئەوە لەخواناسیەوە نزیکە هەر ئەوەش لەخوا نزیکترتان دەکاتەوە)).

کاتێك موسوڵمانەکان گوێ بیستی ئەم ئایەت و ئامۆژگاری زاناکە بوون، بەبێ دەنگی و بەڕێزەوە دەست بەجێ هۆڵی دادگایان جێ هێشت و چوونە دەرەوە،

دادوەرەکەش فرمێسکی بەچاودا هاتە خوارەوە و چەند جارێك بەسەر سوڕماییەوە پرسیاری لەزانایەکە کردو ووتی : ئەوە ئایەت و فەرمانی خودایە ؟

دادوەرەکە هەرخۆی وەڵامی داوە و ووتی : بەڕاستی هیچ یاسایەك لەسەر ڕووی ئەم زەوی یە نیە بەئەندازەی ئەم قورئانە دادپەروەرترو ڕاست تر بێت،

پاشان دادوەرەکە ڕووی لەهۆزەکەی تر کردو ووتی : ئەو پارچە زەوی یە ماف و موڵکی ئێوەیە و پیرۆزی خۆتان بێت بڕۆن وەرتان گرتەوە، پیاوانی هۆزەکەش زۆر بەڕێزو شکۆمەندی و خۆشحاڵیەوە سوپاسی دادوەرو زانا موسڵمانەکەیان کرد لەسەر گەڕانەوەی ئەم مافەیان، بەخۆشحاڵیەوە هۆڵی دادگایان جێ هێشت و موڵکەکەی خۆیان وەرگرتەوە، هەر بەم هۆیەوە کەسانێك لەنێو ئەو هۆزە بوون بەموسڵمان، هەروەها ساڵانێکە خەڵکانێکی زۆر لەو هۆزە بەرەو ئیسلام دێن .

# ووتەکانی ((تەرازوو))

خودای گەورە دەفەرمووێ : ﴿إنَ اللهَ يَأمُرُ باالعدلِ والإحسان﴾ النحل ٩٠

واتە : ((بەڕاستی خودا فەرمان بەدادپەروەری و چاکەکاری کردووە و دەکات)).

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ ((حەوت جۆر کەس هەن لەڕۆژی دوایی دەچنە ژێر سێبەری پەروەدگار، یەکێ لەوان حاکمی خواناس و دادپەروەرە)) ئیمامی بوخاری گێڕاویەتیەوە.

لەکتێبی زەبور کە بۆ داود پێغەمبەر(عليه الصلاة والسلام) هاتووە.

(( دادپەروەری تەرازووی خودای بەدیهێنەرە، هەر لەبەرئەوەیە خودا لەهەموو کەم و کوڕیەك و کەوتنێك بەدوورە)).

ـ ئەگەر ڕەشوە لە پەنجەرە بێتە ژوورەوە، دادپەروەری لەدەرگاوە دەچێتە دەرەوە .

ـ دادپەروەری خودا لەوەدایە هەربەڵایەك دێتە سەربەندەکەی، کۆمەڵێ لەنیعمەتەکانی خودا دەوری دەدەن .

ـ دەنگ و زەنگی پارە، دەنگ و زەنگی عەدالەت کپ دەکات .

ـ یاسای ڕاستەقینە، هەموو کەسێ دەلێسێتەوە بەبێ جیاوازی .

خودا دەفەرمووێ : ﴿والسَماءَ رَفعَها وَوَضَعَ الميزان﴾

خودای گەورە ئاسمانی بەرزکردۆتەوە، هەربەهۆی هاوسەنگی ئەو تەرازووەیە کە هەموو بوونەوەرو ئاسمانەکان و زەوی ڕاگیراوە.

ـ ئەگەر تەرازووی بوونەوەر خوار ببێ، بێ گومان هەموو بوونەوەر بەئاسمان و زەوی یەوە بۆماوەی چەند ڕۆژێك تەخت و وێران دەبێ و ژیان کۆتایی پێ دێ .

ـ ئەگەر هاوسەنگی تەرازووی دادگا خوار ببێ، بێ گومان ستەم و دکتاتۆریەت زاڵ دەبن و کۆمەڵگەش دەچەوسێتەوە .

ـ ئەگەر هاوسەنگی تەرازووی بازاڕ خواربێ بێ گومان فرت و فێڵ لەکڕین و فرۆشتن زۆردەبێ و بازاڕی ڕەش دروست دەبێ و برسیەتی بڵاودەبێتەوە .

ـ خەڵکانی ستەم لێکراو دادپەروەریان خۆش دەوێ، بەڵام زۆردارەکان بەهۆی ستەم کردنیان ڕقیان لەدادپەروەریە .

ـ دادپەروەری دەسەڵاتدار زۆر چاکترە لەخێرو بەرەکەتی زەمانە .

ـ کاتێك پارە قسە دەکات، عەدالەت بێ دەنگی هەڵدەبژێرێ.

ـ هەر دادپەروەریە بچووکەکان لە گەورەکان دەپارێزێ، بەڵام مانای یاسا لەکۆمەڵگەی ئێمە واتە خۆسەپاندنی گەورەکان بەسەر خەڵکانی بێ دەسەڵات .

ـ دزە گەورەکان، مەسینە دزی لەسێدارەدەدەن .

ـ یاسا لای ئێمە وەك خانووی جاڵ جاڵۆکەیە، بچووکەکان دەکەونە نێوی، کەچی گەورەکان لەتی دەکەن و بەناوی تێدەپەڕن .

ـ لەهەر جێگەیەك ڕووناکی هەبێت، سێبەری تاریکیش هەیە .

ـ یەکێ لەدوعای خواناسانی پێشوو ئەوەبوو لەکاتی پاڕانەوە دەیان ووت :

{یامَن عطاؤهُ عطاء ومنعهُ عطا}.

واتــە : (( ئــەی نەوخودایــەی بەخــشینت بەخــشینە، وە لێگرتنەوەشــت هــەر بەخشینی بەدوا دێ)) .

ــ ڕاســتی و چـاکە و ڕەوشــتی پــاك، پەیوەنــدیان بەدادپەروەریــەوە هەیــە، وە بەخــشندەیی و شــەرم و حــەیا و خۆپاراســتن، پەیوەنــدیان بــەدەروونی پاکــەوە هەیە .

ــ ئــەوەی بۆخــۆت ناتــەوێ دەربــارەی کەســانی تــر مەیکــە، چــوونکە لــەوەدا دادپەروەری هەیە، وە لەدادپەروەری ڕازی بوونی خوداو ئادەمیزاد هەیە .

ـ هەندێ قسە ئەگەر لەکاتی خۆی نەووترێ، دواتر هەمووشت وێران دەکات .

ــ ئێمــە هــەموومان بــۆ دادپــەروەری ڕێــز دەبەســتین، بــەڵام کاتێــك لــەدەرگای دادپەروەری نـ

ـ کەسێك پارەی کەسێك ببــات، لــەدادگا توونــدترین ســزای بەســەر دەســەپێنن، کەچی کەسێك ســامانی گشتی ببــات، لەســەر تــەختی پاشــایەتی، فــەرمانڕەوایی دەکات

# ژیانی سادە
# ((ژیانی خۆمان چاکترە))

خاتوو مەهسا دەگێڕێتەوە و دەڵێ : شارۆچکەکەی خۆمان لەقەراغ دەریایە، من و ئەمیر ژیانی هاوسەریمان پێك هێنا، خۆمان بە بەختەوەرترین خانەوادە دەزانی، بەتایبەتی لەدوای ئەوەی کوڕێکمان بوو ناومان لێنا ((عەلی))، ژیانمان جۆرە خۆشیەکی تری بەخۆوە بینی، ئەمیر کاروپیشەی ڕاوکردنی ماسی بوو لەدەریا لەگەڵ چەند پیاوێکی شارۆچکەکەمان، بەهۆی ئەم کارە ئەمیر توانی حاڵی خانەوادەکەمان لەهەموو ڕوویێکەوە بەرەو پێش ببات، سوپاس بۆخودا پێویستمان بەیارمەتی هیچ کەس نەبوو،

ساڵانێك بوو لەژیانێکی خۆش و سادە دەژیاین، ئەو ڕۆژەی بەیانیەکەی ئەمیر وەك ڕۆژانی تر بەرلەوەی بۆکاری ڕاوچییێتی بڕوات، نێوچەوانی عەلی ماچ کردو ماڵئاوایی لەمن کرد، هەر ئەو ڕۆژە بوو دەریا شەپۆلی بەهێزی هێنا، ئەمیر لەوکاتە لەنێو دەریابوو شەپۆڵ و گێژەلووکەی دەریا ڕاپێچی کردو بەرەو قوڵایی دەریاو مەرگی برد، تەنانەت دۆستەکانیشی نەیان توانی نزیکی گێژەلووکە ببنەوە بۆ ڕزگارکردنی ئەمیر، لەکاتی ڕۆژئاوابوون دۆستە ڕاوچیەکانی ئەمیر بەهاوارو گریانەوە گەڕانەوە شارۆچکەکەمان، هەواڵی خنکانی ئەمیر لەنێو شارۆچکەکەمان بڵاوبۆوە، بەڕاستی بەلای من و عەلی کوڕە بچووکەکەم ناخۆشترین ڕۆژ لەژیانی مرۆڤایەتی، ئەو ڕۆژەبوو کە ئەمیری تێدا خنکا، ئەمیر نەك هەر لەئێمە ڕۆی بەڵکو لەهەموو دۆستەکانیشی ڕۆیشت، چوونکە لەکاری ڕاوچییێتی لەهەموو دۆستەکانی شارەزاتربوو بۆیە بەبرا گەورەی خۆیان دانابوو، لەهەموو ڕوویێکەوە موتمانەیان پێ ی هەبوو، هەروەها لەنێو شارۆچکەکەمان

کەسێکی خۆشەویست بوو، هەرچەندە چەند ڕۆژێك بوو بۆ پرسەو سەرەخۆشی ماڵەوەمان پڕبوو لەدۆست و دراوسێمان و دڵنەواییان دەکردم، بەڵام هەستم بەتاریکی یەکی تەواو دەکرد، هەموو دۆستەکانی ئەمیر لەگەڵ خێزانەکانیان دەوریان دابووم و دڵنەواییان کردم و ووتیان تۆ خوشکی گەورەی هەمووومانی، دڵنیابە لەهەموو ڕوویێکەوە چاودێری ژیانی ئێوە دەکەین و خزمەتتان دەکەین،

ماوەیەك ژیانمان هەموو ساتێك ماتەمین و غەم و پەژارەبوو، هەفتەی چەند ڕۆژێك لەگەڵ عەلی دەچووینە قەراغ دەریاو سەیری دەریامان دەکرد، لەبەرئەوەی ئەو دەریایەمان بەگۆڕی ئەمیر دەزانی، ئەوسەردانەمان بۆ قەراغ دەریا بەچاکترین دڵنەوایی دەزانی، ئێواران دۆستانی ئەمیر ماسی و پێداویستی ڕۆژانەیان لەبەر دەرگا دادەناو لەدەرگایان دەدا، کاتێك دەچووم کەسم نەدەبینی تەنها شتەکان دانرابوو، ساڵانێك بوو بەم شێوە ژیانمان تێپەڕکرد،

هەرچەند بەهێنانی ئەم شتانە من و عەلی نارەحەت بووین، لەگەڵ ئەوەی نەمان دەتوانی بەدۆست و دراوسێ یان بڵێین پێویست بەم کارە ناکات، بەڵام جارێکیان من و عەلی کوڕم لەقەراغ دەریا قسەمان لەگەڵ دۆستە ڕاوچی یەکانی ئەمیر کرد، ووتمان : پێویست ناکات خۆتان سەغڵەت بکەن، ئێمە زۆر سوپاستان دەکەین بۆ ئەو هەموو چاکەیەی ئێوە لەگەڵتان کردووین، بەڵام ئەوان گوێیان بەقسەی من و عەلی نەدا .

بەهەر حاڵ من هەرگیز لەچاکەو دڵسۆزی ئەوان دەرناچم، ئەوکاتەی عەلی کوڕم تەمەنی گەیشتە ١٢ ساڵ، ووتی : دایکە حەزدەکەم کاری پێڵاو دوورین لەبازاڕی شارۆچکەکەمان بکەم، منیش ووتم : کوڕی خۆم ئەوکارەم زۆر پێ چاکە، منیش بیرم لەوەکردۆتەوە ئەگەر ئافرەتێکی بەساڵاچوو یان

خانەوادەیەكی هەژار هەبوو ئێمە ژوورەكەی پێشەوەیان بەكرێ پێ دەدەین، ئەوەش بۆئێمە داهاتێكەو دەتوانین لەسەر پێ ی خۆمان بوەستین .

هەربۆ سبەینێ عەلی چوو بۆلای خاڵە نادر وەك شاگردێك لەدوكانەكەی ئەو دەستی كرد بەكاری پێڵاو دوورین، خاڵە نادر پیاوێكی خواناس بوو، لەشارۆچكەكەمان ناوبانگی باشی هەبوو، ڕۆژانە لەسەر كارەكەی، عەلی فێری وانەی ژیان دەكردو زۆر ئامۆژگاری دەكرد.

ڕۆژێكیان خاڵە نادر بە عەلی ووت : ئەوپیاوە ناوی (حاجی كەریم)ە تەمەنی نزیكەی حەفتا ساڵە، هاتووە ژوورێك یان خانوویەكی بچووك لەشارۆچكەكەمان بەكرێ بگرێت و تییدا بژییت، پێدەچێ ئەم پیاوە بەتەمەنە كەسێكی خواناس بێ، ئێستاش لەگەڵ خۆت بۆ ماڵەوەی ببەو بەناوی منیش قسە لەگەڵ دایكت بكەو پێ ی بڵێ : ژوورەكەی خۆتان بەحاجی كریم بەكرێ بدەن و حەقی خۆتانی لێ وەرگرن،

كاتێك بینیم عەلی كوڕم لەگەڵ پیرەمێردێك بۆ ماڵەوە هاتەوە، منیش بەسەر سوڕماییەوە سەیرم كردن بەرلەوەی هیچ شتێك بڵێم عەلی هەموو باسەكەی بۆ گێڕامەوە.

حاجی كەریم زۆر بەنەرمیەوە ووتی : كچی خۆم تۆ وەك كچی گەورەی منی، هەروەها عەلی نەوەی خۆمە، من لەشاری (كرمەشان) هاتوومە، ماوەیەكە تووشی نەخۆشی دڵ بوومە، پزیشكان ڕێنماییان كردوومە بڕۆمە شوێنێك كەش و هەوایەكی پاكی هەبێت، بۆئەوەی تۆزێ دڵم بحەسێتەوەو بەسەلامەتی ژیان بەسەر ببەم، ئێستاكەش ئەگەر قبوڵم بكەن حەقتتان بەزیادەوە پێدەدەم، لەبەر ئەوەی لە ئاغای نادر لەبارەی ئێوە هەموو شتێكم بیستووە.

منیش زۆر بەڕێزەوە بەرەو ژوورەکەی پشتەوە بردم و بەخێرهاتنێکی گەرم و گوڕم لێکرد، حاجی کەریم کەسێکی خواناس و زۆر تێگەیشتوو بەشەرم بوو ماوەیەك ژیانی لەم ژووره بەسەربرد، ڕۆژانە بەرەو قەراغی دەریا دەڕۆیشت و قورئانێکی پێ بوو لەگەڵ خۆی دەیبرد، لەقەراغ دەریا دادەنیشت دەستی بەقورئان خوێندن دەکرد،

ڕۆژێکیان منیش بەنیازی سەردانی دەریا بۆئەوەی لەقەراغ دەریا دوعا بۆ ئەمیر بخوێنم، چوونکە وەك باسم کرد بۆمن و عەلی ئەم دەریایە دڵنەواییەك بوو بۆئێمە، لەبەرئەوەی بەگۆڕی ئەمیرەکەم دەزانی، لەوکاتە بینیم حاجی کەریم لەقەراغ دەریا دانیشتووە قورئان بەدەنگێکی خۆش دەخوێنێ، جارجار دەگریا نەیدەتوانی لەخوێندنەکە بەردەوام بێ، پاشان فرمێسکی چاوەکانی دەسڕیەوە و دووبارە دەستی بەخوێندنەوەی قورئان دەکردەوە،

بەیانیەك وەك ڕۆژانی پێشوو خواردنم بۆبرد ووتم : حاجی کەریم تۆ ڕۆژانە بەرەو قەراغی دەریا دەڕۆی زۆر دەگری و فرمێسك دەڕێژی، هەست دەکەم شوێنەواری گریان بەدەوری چاوت زۆردیارە، ئەوەندە خۆت ماندوو مەکە چونکە تۆ نەخۆشی بۆتۆ باش نیە !

حاجی کەریم هەناسەیەکی هەڵکێشاو بەچاوی پڕ لەفرمێسك ووتی : کچی خۆم من زۆر لەمردن نزیك بوومەتەوە و بەم زووانە بەرەو لای خودا دەگەڕێمەوە، بۆ پەیداکردنی ماڵ لەدونیا زۆرم هەوڵ دا کەچی منداڵ و نەوەکانم شەڕو هەلا لەسەر ماڵ و سامانەکەم دەکەن، خۆزگە هەر لەزووەوە لەم ژیانە سادەیە ژیانم بەسەر ببردایە.

منیش غەمی دڵی خۆم بۆ حاجی کەریم باس کردو بەگریانەوە ووتم : حاجی کەریم مـن و ئـەمیر تـەنها خـاوەن عـەلی بـووین کـە ((ئـەمیرم)) لەدەسـت چـوو لەدەریا خنکا،

حـاجی کـەریم بەزەردەخەنــەوە ووتــی کـچی گـەورەم تـۆ پیاوەکـەت بـەمردن لەدەست چوو، دڵنیابە خودا بەخشندەیەو لێ ی خۆش دەبێ، بەڵام من کوڕەکـانم بەزیندوویەتی لەدەست چووە، کوڕەکانم بەشێوەیەك کەوتۆنەتە نێو دونیا، دین و دینــدارییان فـەرامۆش کـردووە و گـوێ بـەئامۆژگاری مـن و گـەوران نــادەن، بەڕاستی گەنجانی ئەم سەردەمە ئەگەر ماڵ و سامانی زۆریان دەست بکەوێ ئیتر لەخۆبایی دەبن و ڕێگای خراپە دەگرنەبەر.

من هەموو بەیانیـەك خواردنم بۆ حاجی کەریم ئامـادەدەکردو بـۆم دەبـرد و سـاتێك لەبەرامبــەری دادەنیــشتم زۆر بــەئارامی نــانی دەخـواردو فــەرموودەی پێغەمبەری (ﷺ) و قسەی خۆش و بەسەرهاتی خواناسانی بۆباس دەکردم.

کاتێك ئێوارانیش عەلی لەکارەکەی خۆی دەگەڕاوە ماڵەوە، دووبارە خـواردنم بۆ حاجی کەریم دەبردو هەندێك قسەی خۆشی بۆ دەکردین و پاشان من ئـەو و عەلی کوڕم بەجێ دەهێشت، ئامۆژگـاری عـەلی دەکـردو پاشـان دەسـتیان بەقـسەی خـۆش و پێکـەنیناوی دەکـرد، کاتێـك عـەلی دەهاتـەوە ژوورەکـەی خـۆم سـەیرم دەکرد زۆر ئاسوودەو ڕوو خۆشە،

بەڕاستی من و عەلی هەستمان دەکرد حاجی کەریم دیارییەکی خوداییە بـۆ ئێمـە هـاتووە، چـوونکە بەڕاسـتی بـەبوونی ئـەو زۆر زۆر خۆشـحاڵ و شـادومان بووین،

جارجاریش خاڵە نادر سەردانی دەکرد، هەروەها پەیوەندی لەگەڵ پیاوانی شارۆچکەکەمان زۆرپتەو کردبوو، حاجی کەریم لەلای خەڵکی شارۆچکەکەشمان جێگای ڕێزو شانازی بوو،

ڕۆژێکیان دوو ئوتۆمبێل بۆ شارۆچکەکەمان هاتن و لەنێو بازاڕ عەلی لەگەڵیان هاتەوە بۆ ماڵەوەمان، لەڕەنگی و ڕوخساریان دیاربوو منداڵ و نەوەی حاجی کەریم بوون، لەوکاتە حاجی کەریم لەماڵەوە دەرچووبوو، بە عەلی کوڕم ووت لەگەڵیان بۆ قەراغ بڕۆ لەبەرئەوەی حاجی کەریم وەك ڕۆژانە بەرەو قەراغی دەریا ڕۆیشتووە، ئینجا بەرەو دەریا ڕۆیشتن و دوای ماوەیەکی کەم بەرەو ماڵەوە هاتنەوەو حاجی کەریمیان لەگەڵ خۆیان هێناوە، گشتیان لەحەوشەکەی ماڵەوەمان دانیشتن و حاجی کەریم ڕووی لەمن کردو بەزەردەخەنەوە ووتی : کچی گەورەم نابینی منداڵ و نەوەکانم هاتوونە بۆ شارەکەم بمگەڕێننەوە بۆ ئەوەی بەخێرایی بمرم،

لەوکاتەی کچێکی خۆی بەگریانەوە سەری خستە سەرشانی حاجی کەریم ووتی : باوکە گیان ئەم ماوەیە تۆ هەمووومانت بێ باوك کرد !

حاجی کەریم : سەری کچەکەی خۆی ماچ کردو ووتی : کچی خۆم من لەسەر ڕێنمایی پزیشك هاتم بۆئێرە، بەڵام ئەگەر لەسەرەتا بمزانیبوایە ئەم ژیانە پڕ لەخۆشی و سادەیە لێرە هەیە، دڵنیابە هەمووتانم لێرەوە گەورەو پەروەردە دەکرد، بەڕاستی کەش و هەوای ئێرە خۆشی ژیانت پێ دەبەخشی، بەڵام چی بکەم بەرگەی گریان و پاڕانەوەی ئێوە ناگرم، ناچارم لەگەڵتان بۆ شارەکەمان بگەڕێینەوە،

ئینجا حاجی کەریم عەلی کوڕمی بانگ کردو لەتەنیش خۆی جێگای بۆکردەوە و بەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە سەری عەلی ماچ کردو پاشان سەیرێکی منی کردو ووتی : کچی گەورەم من لەڕۆژی دواییش خۆم بەقەرزاری تۆو عەلی دەزانم، بڕوابکە تۆئێستاش لەلای من لەگەڵ منداڵەکانم و نەوەکانم هیچ جیاوازیەکتان نیە، بەڵکو لەلای من لەئەوانیش بەڕێزترو خۆشەویسترن، ئێستاش دەبێ لێم قبوڵ بکەن کە ماڵئاواییتان لێ بکەم !!!

منیش خۆم پێ نەوەستا زۆر بەزەییم هاتەوە بەحاڵی خۆم و عەلی کوڕم و دەستم بەگریان کرد، بەڕاستی لەبەر گریان هیچم پێ نەووترا، لەوکاتە کچەکانی حاجی کەریم باوەشیان لەمن دا و ماچیان کردم و دڵنەواییان کردم ، حاجی کەریم بڕێك پارەی خستە نێو دەستی عەلی کوڕم ، پاشان کچێکی حاجی کەریم چووە ژوورەکەمان دوای چەند ساتێك لە ژوورەکەمان هاتە دەرەوە، هەروەها حاجی کەریم ئەو قورئانەی لەگەڵ خۆی هێنابووی دایە دەستی من و ووتی : کچی گەورەم ئەم قورئانە بەچەند پشتێك لەباووباپیرانم بۆم ماوەتەوە، ئاگاداربن دەزگای فەرهەنگ و شوێنەوارناسان نرخێکی زۆری پێ دەدەن، منیش لەلای خۆمەوە ڕازیم بەهەر نرخێکی زۆر بەفرۆشتن خەڵاتی بکەن،

پاشان حاجی کەریم ماڵئاوایی لەمن و عەلی کوڕم و خەڵکانی شارۆچکەکەمان کرد، بەتایبەتی ماڵئاواییەکی گەرم و گوڕی لەخاڵە نادر کردو ووتی : ئاغای نادر داواکارم لەبەڕێزت چاو تورکانێکیش بێ ئاگا مەبە لەژیانی عەلی و دایکی !

پاشان حاجی کەریم لەگەڵ منداڵ و نەوەکانی، شارۆچکەکەیان جێ هێشت و بەرەو شاری خۆیان گەڕانەوە .

بەڕاستی لەدوای ڕۆیشتنی حاجی کەریم وام زانی تازە باوکم مردووە و زۆر نارەحەت بووم .

بەستیەوە چوومەوە ژوورەکەی خۆمان ویستم قورئانەکە لەتاقەکەی ژوورەوە دابنێم، بینم ملوانکەیەك و چەند تاکە بازنەیەکی زێڕ لەژوورەوە دانراوە، ئینجا زانیم کچەکەی حاجی کەریم کاتێك چووە ژوورەکەمان ئەم زێڕانەی داناوە،

هەستم کرد حاجی کەریم لەهەموو ڕوویێکەوە بۆ ئێمە بووبە خێروبەرەکەت، بەتایبەتی لەلایەنی ڕۆحی یەوە، من و عەلی کوڕم زۆر پێ ی ئاسوودەبووین .

پاش ماوەیەك عەلی توانی بەپاڵپشتی خاڵە نادر، دوکانێك دابنێ و ئێوارانیش لای مامۆستاو پێش نوێژی مزگەوتەکەمان فێری قورئان خوێندن ببێت .

دوای چەند ساڵێك بەرێگای مامۆستای مزگەوتەکەمان دەزگای فەرهەنگ پارێزو ئاسەوارناس هاتن و قورئانەکەی ((حاجی کەریم)) یان بینی و ڕوویان لەمن و عەلی کوڕم کردو ووتیان : ئەم قورئانە وەك ئاسەوار پارێزراوە، نزیکەی ۲۰۰ ساڵە ئەم قورئانە چاپکراوە، واتە چاپ کردنەکەی بۆ ۲۰۰ ساڵ بەر لەئێستا دەگەڕێتەوە، هەرئەوکات لەبەرامبەر ئەم قورئانە قورئانێکی چاپی نوێیان دا بەدەستی عەلی و ووتیان ئەمە تەنها بەرامبەر قورئانەکە ئەم قورئانەمان پێدای، هەروەها لەحەقی کۆنی و ئاسەواری قورئانەکە پارەیەکی زۆریان پێ دایین و ووتیان ئەم پارەیە حەڵاڵی خۆتانەو پیرۆزتان بێت، بەڵام تەنها دەمانەوێ شوێنی حاجی کەریممان پێ نیشان بدەن بۆئەوەی بچین قسە لەگەڵ ئەو بکەین،

کەچۆن توانیویەتی بەچەند پشتێك ئەم قورئانە بپارێزن : ئێمەش ناونیشان و شوێنی حاجی کەریممان بەئەوان دا .

دواتر چوونە سەردان و ماڵی حاجی کەریم، بەڵام حاجی کەریم ساڵانێك بوو کۆچی دوایی کردبوو، ئێمەش هەر لەڕێگای ئەوانەوە زانیمان حاجی کەریم مردووە، بەڕاستی حاجی کەریم لەو ماوە کەمەی کەلامان بوو، لەدوای ڕۆیشتنی ژیانێکی پڕ لەیادەوەری بۆ ئێمە بەجێ هێشت، من لەکاتێك بەسەرهاتی ژیانی خۆم و خانەوادەکەم بۆ کارمەندانی گۆڤارەکەتان دەنووسمەوە، ئێستا عەلی کوڕم خاوەن خێزانەو منداڵێکی چاوگەشی هەیە، کە بەناوی باوکی کردۆتەوەو ناوی ناوە (ئەمیر)، منیش لەگەڵ ئەوان ژیانێکی پڕ لەیادەوەری بەسەر دەبەم، هەرچەندە هەندێ لەخەڵکانی شارۆچکەکەمان هانمان دەدەن و دەڵێن : ئێوە ماڵ و حاڵتان زۆرباشەو دەتوانن بچن لەناوەڕاستی شار، خانوو بۆخۆتان بکڕن، بەڵام من و عەلی و هاوسەرەکەی ئەم ژیانە سادەی خۆمان لەهەموو شتێك پێ خۆشترە، بەتایبەتی من هەرگیز ئامۆژگاریەکانی حاجی کەریم لەیاد ناکەم کە دەیووت : خۆزگە هەر لەسەرەتاوە ئەم ژیانە سادەم بۆخۆم و منداڵەکانم هەڵبژارد بوایە. ئێستاش ئەم ژیانە سادەی خۆمان بەهەموو خۆشی دونیا ناگۆڕمەوە، دەبێ لەدوای مردنم گۆڕەکەم لەنزیك دەریاوەبێت، بۆئەوەی لەباوکی عەلی نزیك بم .

# ووتەکانی ڕۆژگار

**خوای گەورە دەفەرمووێ: (( انما هذه الحياة الدنيا متاع وانَ الاخِرة هِيَ دار القرار)) (غافر – ٣٩)**

- واتە : بێ گومان ژیانی دونیا بریتی یە لەڕابواردنێکی کەم، بەڕاستی هەر ژیانی ڕۆژی دوایی شوێنی حەسانەوەی بەردەوامە .

- دونیا بەبیرکردنەوە مەکە بەشوێنی غەمت یان شادیت بەڵکو بیکە بەشوێنی کار .

- خواناسان ووتویانە : گەر دەتەوێ خۆشبەخت ببی، دەبێ هەوڵ بدەی هەم خۆت هەم ناوت لەنێو خەڵك وون بکەی .

- ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) لەبارەی بێ نرخی دونیا فەرموویەتی : لەدونیا بەنرخترین بەرگ لیکی کرمی ئاوریشمە، خۆشترین و چاکترین خواردنەوەکەش هەنگوینی نێو هەناوی مێش هەنگوینە .

- ئەوەی لەدونیا چاو برسی بێ بەهیچ شتێك تێرنابێ .

- هەرکەسێ لەم دونیایە بیر لەچارەنووسی خۆی بکاتەوە، بێ گومان ئەم دونیایە بەگەشتێك دەزانێ و هەردەم کاروباری ڕێك دەخات لەبەر ئەوەی دەزانی گەشتێکی تری لەپێشە .

- نانێکی ووشك لەگەڵ ئەمن و ئارامی، چاکترە لەهەنگوینێك لەگەڵ ترس .

- لەژیانی دونیا رکابەری و ململانێ زۆرە، بەڵام هیچ پاساوێك نیە بۆشاردنەوەی حەق و ڕاستی.

- دوونەهامەتی هەیە لەکاتی سەرەمەرگ ڕوو لەمرۆڤ دەکات ،

یەکەم : ماڵ و سامانەکەی هەموو لێ دەسێنرێ واتە جێ ی دەهێڵێ .

دووەم : لێپرسینەوەش لەهەموو ئەم ماڵ و سامانەی لەگەڵ دەکرێ .

ـ لەدونیا غەمەکان زۆرترن لەخۆشی و شادی یەکان، سەرفرازی کەمترن لەنەهامەتیەکان.

ـ فارس ووتوویانە: هەرچەند لەسروشت نزیك ببیەوە، بێ گومان ژیانی شایستەترت بۆ دەرەخسێ .

ـ خۆشیەکانی دونیا وەك مانگی چواردە، لەمانگێ تەنها جارێك دەبینرێت .

ـ هەرگیز لەبرسیەتی نابیستی بڵێن : نان ڕەقە، هەرگیز لەسەرماو سۆڵ نابیستی بڵێن : چاکەتەکەت کۆنە .

ـ کارکردن بەحەڵاڵی مرۆڤ لەسێ بەڵا بەدوور دەگرێ :

١ – خەمۆکی ٢ – بەدکاری ٣- هەژاری

ـ لەپیاو چاکێك پرسیارکرا : ـ ژیانت چۆن دابین کردووە ؟

ووتی لەسەر چوار پایە :

١– زانیم کەڕزقی من کەسێکی تر نایخوات، ئیتر ئارام بووم،

٢– زانیم کەخودای گەورە من دەبینێت، ئیتر بەشەرم و بە ئەدەب بووم،

٣– زانیم کاری من کەسێکی تر ئەنجامی نادات، ئیتر هەوڵم دا،

٤- زانیم کە کۆتای کاری من مردنە، ئیتر خۆمم بۆ ئامادەکرد .

# ژیانی پاشەڕۆژ

## ((زەوی یەکە ژێری گەنجینەیە))

دەگێڕنەوە پیاوێکی جووتیار، زەوی و زارێکی زۆری هەبوو بەتەنها خۆی لەزەوی یەکەی کاری دەکردو لەگەڵ ئەوەش کۆمەڵە کوڕێکی هەبوو، بەڵام هەموو کوڕەکانی تەمبەڵ و دەست بەتاڵ بوون، هەرگیز دەستیان بۆکارکردن نەدەبرد،

پیاوە جووتیارەکە بەدرێژایی تەمەنی، خۆی بەتەنها کاری لەزەوی یەکە دەکرد، بەم هۆیەوە خانەوادەکەی بەخێو دەکرد، تا ئەوکاتەی پەکی کەوت و کەوتە سەرجێگاو لەمردن نزیك بووەوە، کوڕەکانی بەدەوریەوە بوون، دڵنەوایی باوکیان دەکرد ،

باوکیشیان بەرلەوەی گیانی بسپێرێ بە کوڕەکانی ووت : لەدوای ئەوەی وەك خانەوادەکەمان لەو زەوی و زارە سوود مەندبووین، ئێستاش وەسیەت و ئامۆژگاریتان دەکەم و ئاگادارتان دەکەم ئەو زەوی و زارەی خۆمان، ژێرەکەی گەنجینەی تێدایە و بۆخۆتان هەولی بۆ بدەن بیدۆزنەوە، کوڕەکانی بەسەرسوڕماییەوە سەیری یەکتریان کرد، پاشان باوکیان گیانی سپاردو مرد.

چەند ڕۆژێك دوای مردنی باوکیان، کوڕەکانی هەموو کەل و پەلی زەوی و زارەکەیان هەلگرت و چوونە سەر زەوییەکەی خۆیان، دەستیان کرد بەهەلکۆڵینی زەوییەکە، ماوەی چەند ڕۆژێك بست بەبستی ئەم زەوی یە فراوانەی باوکیان هەلکۆلی و هیچیان نەدۆزیەوە، بەڵام لەو ماوەیە ئەوەندە

کاریان تێدا کرد بۆ دۆزینەوەی گەنجینە، تا بەم هۆیەوە ڕاهاتن لەکارکردن، ئینجا لەنێوان خۆیان ووتیان : باوکمان کەسێکی زۆر زیرەك بووە، لەئێمە بێ ئومێد بوو کە بتوانین کاربکەین، بۆیە ئەم ڕێگایەی پێ نیشان داین، بۆئەوەی دەستمان لەکار گیرببێ و واز لەتەمبەڵی بهێنین و پاشەڕۆژو ژیانی خۆمان بەکاری جوتیاری بەڕێوە ببەین،

هەربۆیە کوڕەکانی پیاوە جووتیارەکە لەکێڵان و تۆکردن و چاندن بەردەوام بوون، هەموو ساڵان کاتێ لەبەرووبوومی زەوی و زارەکەیان قازانجیان دەکرد، وەسیەت و ئامۆژگاریەکەی باوکیان وەبیر خۆیان دەهێناوە، دوای ساڵانێك بوون بەخاوەنی ماڵ و سامانێکی زۆر، ئینجا ووتیان : گەنجینەکەی باوکمان قسەوباسی لێ کرد، بەدەستمان گەیشت و پاشەڕۆژی ئێمەی زامن کرد .

# ووتەکانی ((کار))

ـ خـودا فەرموویـەتی ئـەی بـڕواداران پارێزگـاری لەفەرمانـەکانی خودابکـەن، سەیرکەن بزانن چیتان بۆسبەی ئامادەکردووە ؟

ـ وەستا ئەگەر خشتی یەکەمی بەخواری دابنێ، تاسەر، دیوار هەر خواردەبێ.

ـ هەرچی گوڵ و دانەوێڵەی ئەمڕۆ هەیە، هەموو تۆی دوێنێ یە.

ـ پارەی سپی بۆ ڕۆژی ڕەش هەڵگرە.

ـ خاکی بە، بەرلەوەی ببی بەخاک.

ـ بڕواداران لەژیانی دونیا وەك کرێکارن، لەناوەڕاستی ڕۆژو لەکاتی کە بـەرگی ئیش و کاریان لەبەرە، ئامادەنینە ئەوکات بەرگی خـاوێن و نـوێ بپۆشـن، بـەڵکو ئارام دەگرن تا ئەوکاتەی کارەکانیان تـەواو دەبـێ و پاشـان پاداشـت وەردەگـرن و جل و بەرگی نوێ و خاوێن دەپۆشن.

ـ لەگۆماوی درۆدا تەنها ماسی یە مردووەکان مەلەدەکەن.

ـ منداڵێك کە پرسیار دەکات گێل نیە.

ـ نرخی ئاو بەفیڕۆ مەدە پێش ئەوەی کانی و بیرەکان ووشك بکەن.

ـ لەکاتی مردن ئینجا دەزانی بۆچی بەمنداڵی دەگریای .

ـ نیوەی درۆ، بەبەر پڕو پاگەندە کەوتووە .

ـ ڕۆژی کەسێکی ئاقڵ، لەتەمەنی گێلێك چاکترە.

ـ عەشقی ئافرەت بەدووکەڵ دەست پێدەکات و بەخۆڵەمێش کۆتایی دێت.

ـ ئەگەر خەمی دواڕۆژت نیە بۆچارەسەرکردنی کێشەکانت، فەرموو خۆت بخەنێو زبڵدانی مێژوو.

ـ ڕۆژگاری سەخت، بازو هەڵۆ ناچاردەکات لەگەڵ قەڵە ڕەشەکان خۆراك بخۆن.

ـ ئەگەر بەشەو لەسەرجێگای خۆت ڕاکشای خۆت تووشی خەم و دڵەڕاوکێ مەکە، لەبەرئەوەی مرۆڤ نازانێ بەیانی چی ڕوودەدات .

ـ ئەو گرێیەی کەدەبێتەوە بەهیچ شێوەیەك مەیبڕە.

ـ لەدایك بوون پەیامی مەرگە.

ـ ئەگەر بەگەنجی کات وون بکەی، لەپیری کات وونت دەکات.

شاعیر دەڵێ : ـ

**ليس المراد مِن السحابة الأمطار**

**إنما المراد منها وجود الأثمار**

واتە :

**مەبەست لەهەور تەنها باران نیە**

**بەڵکو مەبەست تێیدا بوونی بەروبوومە**

ـ کەسێ بیەوێ لەدانایی سەرکەوتن بەدەست بهێنێ، نابێ بهێڵێ نەفس و ئارەزووەکانی فەرمانڕەوایی بەسەربکەن.

ـ نەخۆشی بەسواری ئەسپ دێت و بەسواری کیسەڵ دەڕوات .

ـ هەرکەسێ شتێ بکڕێ و پێویستی پێ ی نەبێ، بێ گومان شتێك دەفرۆشێ کە لەپاشەڕۆژ پێویستی پێی ببێ.

- کاتێك تووڕەیی دەدوێت ئەقڵ و بیرکردنەوە کۆتایی پێ دێت.

- زۆرشت لەدونیا پێچەوانە دەبێتەوە، ئەوەی ئەمڕۆ تۆ ڕقت لێ یەتی بەیانی خۆشت دەوێ،ئەمڕۆ خۆت بەکەسێکی شارەزا دەبینی کەچی بەیانی دەزانی کەسێکی نەشارەزاو نەزانی.

- چەند پیربىی، نەخۆشیەکانت گەنجتر دەبن.

- گرینگ نیە دوای من پردەکان بسووتێنن، چوونکە بیر لەگەڕانەوە ناکەمەوە.

- هەرچەند، دار بەرزبێت، کورترین تەور دەگاتە قەدی .

- خودا ژنی لەنێو سەری پیاو دروست نەکرد، تا فەرمانڕەوایی لەسەر نەکات، وە لەنێو پێ ی دروستی نەکرد تانەبێتە کۆیلەی، بەڵکو لەپەراسووی پیاوی دروست کرد، تا هەمیشە نزیکی دڵی بێت .

- لەچوار هێرش بترسە کە دەکرێتە سەرت و خۆتی بۆ ئامادەبکە :-

١ - هێرشی مەلائیکەتی گیان کێشان

٢- هێرشی میراتگرەکانت بۆسەر ماڵەکەت

٣ – هێرشی کرمەکانی نێو گۆڕ بۆسەر لاشەت

٤ – هێرشی ئەو ماف خوراوانەی کە لەڕۆژی دوایی داوای حەق و مافی خۆیان لەتۆ دەکەن و لەپاداشتی کردەوەت کەم دەکەنەوە

- فێری ڕۆیشتن بە، ئینجا ڕاکە.

- شێت پاشەڕۆژی نیە، بۆیە هەموو ڕۆژ بۆ ئەو جەژنە.

- لەیاد ناکەی هەرگیز ڕابردووت لەگەڵ داهاتووت بەرامبەر ناکرێ.

- ووریابە ئەولانکەی تۆ چوویتە باوەشی، برابچووکی دارەمەیتە.

- قەرز بەزەردەخەنە دەڕوات و بەگریان دەگەڕێتەوە.

- کاتێك هێستری قازی دەمرێ هەموو خەڵك بۆ پرسەو سەرەخۆشی دەچنە لای، بەڵام کەخۆی دەمرێ کەس ناچێ.

- هیچ کەس ناچار بەدووکار مەکەن، هاوسەرگیری و شەڕکردن.

- لەوجێگە دامەنیشە کە پێت دەڵێن هەستە.

- ئەوانەی ڕوو لەفاڵچیان و جادوکەران دەکەن، ئەوانە مرۆڤی تەمبەڵ و بێ کارن و دەستیان لەپاشەڕۆژی خۆیان بەرداوە.

- خۆشی بەحاڵی ئەوکەسەی کچیان بووە، چوونکە کوڕ منداڵی خەسوە .

- بزمارێك دەتوانێ ناڵی ئەسپ بپارێزێت، ناڵ دەتوانێ ئەسپ بپارێزێ، ئەسپ دەتوانی سوار بپارێزێ، سوار دەتوانێ ووڵات بپارێزێ.

- کەسێ لەسەر تێری هەربخوات، ئەوە بەددانەکانی خۆی گۆڕ بۆخۆی هەڵدەکەنێت.

- کچی دایکێکی چاك هەڵبژێرە، ئەگەرچی باوکی شەیتان بێت.

- مرۆڤی تەمبەڵ، گۆچانی شەیتانە .

- گرینگ ئەوەنیە کەچ جۆرە سەگێکە، بەڵکو گرینگ ئەوەیە خاوەنەکەی کێ یە .

# (( دارتاش بووبە وەزیر ))

جارێکیان یەکێ لەپاشایەکان بڕیاریدا کەسێکی زیرەك و لێهاتوو بکات بەوەزیرو ڕاوێژکاری خۆی، بەڵام کارەکەی بەشێوەیەك ئەنجامدا، بێ ئەوەی کەس لەمەبەستی ئەو تێبگات .

فەرمانی بەپیاوەکانی دەوروبەری خۆیدا بەنێو سەرتاسەری شارو بەتایبەتی شوێنە گشتیەکان بگەڕێن و قەڵەم و کاغەز بەسەر خەڵك دابەش بکەن .

بۆئەوەی خەڵکی چیان لەدڵیدا هەیە، بەویستی خۆیان لەسەر کاغەزەکە بینووسن .

هەروەها ئەوەی توانای دەست نووسینیشی نەبووایە، هەرچی لەدڵی هەبوو، بەزوبان دەیووت و پیاوانی پاشاش بۆیان دەنووسی .

ماوەیەك پیاوانی پاشا بەفەرمانی پاشا لەسەر ئەم کارە بەردەوام بوون، هەموو ئەو کاغەزانە دەچووە نێو کۆشك، شەوانە پاشا خۆی سەیری یەکە یەکە کاغەزەکانی دەکردو بەووردی دیخوێندەوە .

هەندێ لەکاغەزەکان شیعرو پەخشان و پیاهەڵدانی بۆ پاشا تێدابوو .

هەموو کاغەزەکانی خەڵك لەبەردەم پاشادابوو، هەریەکەو هیواو ئاواتی خۆی تێدا نووسیبوو.

هەندێکیان لەکاغەزەکانیان داوای پلەو پایەیان لەپاشا کردبوو، هەندێکیشیان داوای ماڵ و سامانیان کردبوو .

هەریەکەو بەجۆرێك کاغەزەکەی خۆی بەهەڵێکی زێڕین زانیبوو داواو ئاواتەکانی خۆی تێدا نووسیبوو .

پاشاش دوای ئەوەی بەزەردەخەنەوە کاغەزەکانی دەخوێندەوە، دەست بەجێ دەیخستە نێو کیسەیەك وەك ئەوەی هیچ کارێکی بەم جۆرە کاغەزانە نەبێت .

لەبەردەم خۆیەوە دەیووت : ئای ئەو خەڵکە چەندە نەزانن .

شەوێکیان لەکاتی خوێندنەوەی کاغەزەکان، کاغەزێکی بەرچاوکەوت، بینی کاغەزەکە لەسەری نوسراوە : جەنابی پاشا ! من بۆخۆم داوای هیچ شتێکت لێ ناکەم، تەنها داوایەکەم بۆخۆتە، ئەویش ئەوەیە من کەسێکی دارتاشم لەکاتی بڕینی هەرتەختە دارێك، تەختەکە دەجار پێوانەو قیاس دەکەم، ئینجا دەیبڕم، پێویستە جەنابیشت بۆ هەربڕیارێك بەم شێوەیە بیت، دەجار بیری لێ بکەوە ئینجا بڕیار بدە ! بۆئەوەی نەخۆت و نەووڵاتەکەت نەکەوێتە هەڵەیەکی گەورە.

پاشا کاتێك ئامۆژگاری ئەو دارتاشەی خوێندەوە، بڕیاریدا هەر بەم شەوە بچن کەسی دارتاش بۆنێو کۆشك بهێنن .

کاتێك دارتاشەکەیان هێنا، پاشا چەند پرسیارێکی لەدارتاشەکە کرد، دارتاشەکەش خودی خۆی کەسێکی زۆر دانابوو، زۆر بەزیرەکانە وەڵامی پاشای دەدایەوە .

هەربۆیە پاشا پێ ی ووت : من ئەم شەو بە مەبەستەکەی خۆم گەیشتم دەبێ تۆ لەبەیانی یەوە ببی بە وەزیری دەستە ڕاستم .

هەر ئەوشەو جل و بەرگی وەزیرانەیان بەدارتاشەکە داو بووبە وەزیری دەستە ڕاستی پاشای ووڵات .

دواتر ئەم پاشایە بۆ خۆی و ووڵاتەکەی سوودێکی زۆری لەدانایی ئەودارتاشە وەرگرت .

# ژیانی کەم زانی

## (( ئەگەر تۆ نەیزانی منیش نایزانم ))

حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی ئەوکاتەی والی بوو، بانگی کەسێکی فاڵچی کردو چەند پرسیارێکی لێ کرد، حەجاجی کوڕی یوسف بەفاڵچیەکەی ووت : من چەند بەردێکی بچووکم خستۆتە نێو دەستم ئادەی پێم بڵێ چەند دانەیە ؟

فاڵچیەکە بێ ئەوەی دەستی حەجاج ببینێ ووتی : ئەی حەجاج تۆ دە بەردی بچووکت لەنێو دەستیە،

حەجاج ووتی ڕاست دەکەی دە بەردم لەنێو دەستیە،

جاری دووەم حەجاج مشتێ بەردی بچووکی بێ ئەوەی بژمێرێ، خستیە نێو دەستی و ووتی: ئادەی ئەمجارە چەند بەرد لەنێو دەستمە ؟

فاڵچیەکە ووتی : ئەی حەجاج جاری یەکەم تۆ بەردەکانت ژمارد، بۆیە من لەچاوەکانت زانیم چەند بەردە، بەڵام ئەمجارە خۆشت نەت زانی چەند بەردە، بۆیە منیش نەمزانی چەند بەردە، چوونکە ئەوەیان ((عیلمی غەیبە)) واتە ((زانستی پەنهان و شاراوەیە)) بێ گومان ئەم زانستەش تەنها خودا دەیزانێ، وە هەرچی بوونەوەر هەیە لەبەرامبەر ئەم زانستە نەزانە،

کەواتە : ئەی حەجاج ئەگەر تۆ نەیزانی منیش نایزانم .

## ووتەکانی (( قەڵەم ))

- خودای داناو ڕاست کردار، یەکەم شت دروستی کرد قەڵەم بوو، ئینجا بەشێوەیەك ڕێزی لە قەڵەم گرت سوێندی پێخوارد، کەواتە تۆش ڕێز لەقەڵەم بگرە و حەقی بدە، وووریابە شەڕی خودای پێ نەکەی، چوونکە ئەوپەڕی زوڵم و نەزانی و خیانەتە .

- کلیلی دڵی زانا قەڵەمەکەی دەستیەتی، کلیلی دڵی دانا ئەقڵەکەیتی، کلیلی دڵی نەزان زوبانە شڕەکەیتی .

- حەق و ڕاستی پێویستی بە دووکەسە، یەکێکیان بیڵێت یان بینوسێت، ئەویتریان ببیستێت و لێ ی تێبگات .

- بۆ نووسینی هەرشتێك، دەبێ نووکی قەڵەمەکەت لەزێڕ بەنرختربێت .

- ڕووداوو مەینەتیەکانی ژیان، زۆرجاران زوبان ناتوانێ دەریان بڕێ، چاو ناتوانێ سەیری دیمەنەکانیان بکات، گوێ حەزناکات بیانبیستێ، کەچی قەڵەم بەئاسانی دەیانووسێت، بۆئەوەی بتوانین زۆر بەئاسانی بیانخوێنینەوە و لێیان تێبگەین و فێری وانەی ژیان ببین .

- مَن کانَ صدیق القَلَم

لبثَ اسمه بالکرم

واتە : هەرکەسێ دۆستی قەڵەم بێ

بەردەوام ناوی بەڕێزەوە دەمێنێ

ـ ئیبن و عەتای دانا فەرموویەتی : ئەگەر دۆستایەتی کەسێکی نەزان بکەی کە لەخۆی ڕازی نیە، زۆر چاکترە لەوەی دۆستایەتی زانایەك بکەی کە لەخۆ ڕازی و لەخۆبایی یە .

ـ زانایان ووتوویانە : بۆیە بە ((أبو الحکم)) یان دەووت (( أبو جهل)) واتە باوکی نەزان، لەبەرئەوەی هەموو ڕاستیەکی لەپێغەمبەر(ﷺ) دەبینی کەچی هەردژایەتی دەکرد.

ـ وەکو زانایان بنووسە، وەکوو دانایان قسەبکە .

ـ نەزانی، ئەم زانستە لەتۆ قەدەغە دەکات کە بەرەو لووتکەی سەرفرازیت دەبات .

ـ یەکەمین پلەی نەزانی خۆ بەزانا زانینە .

ـ مرۆڤی نەزان لەسەرەمەرگی خەفەت بۆ ڕۆیشتنی ئارەزووەکانی دەخوات، نەوەك خەفەت لەنەزانیەکەی .

ـ زانا لەنەزانی خۆی ئاگادارە، بەڵام کەسی نەزان وادەزانێ هەمووشتێ دەزانێ.

ـ نەفامترین کەس ئەو نەزانەیە کە نەزانێ نەزانە .

ـ هەوڵبدە کەسی نەزان فێر بکە، بەڵام موجامەلەی لەگەڵ مەکەو فێری موجامەلەی مەکە .

ـ نەزانی برایەکانی یوسف پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لەمەدابوو کاتێك چوون بۆ شاری (میصر) دەمی ووشتروماڵتەکانیان بەستبوو، نەوەك لەڕێگا شتی خەڵك بخۆن، کەچی زۆر بەئاسانی برایەکەی خۆیان خستە بیرێکەوە و پاشان بەنرخێکی کەم فرۆشتیان، پارەکەشیان لەنێوان خۆیان دابەش کرد .

ـ خۆ هەڵکێشان و بەسەر خۆدا گۆتن بەرگی نەزانیە .

ـ قسەیەك هەڵنەسەنگێنی وەڵامەکەی ئازارە .

ـ مرۆڤی خاوەن ژیرو خێرەمەند، هیچ کەسێ دوژمنایەتی ناکات، تەنها شەیتان و نەزانێکی بەدکارنەبێ .

ـ ئەگەر کەسێ نەزان بێ و مامۆستای نەبێ ئەوە پەندی زەمانە بۆی دەبێ بە مامۆستا .

ـ ئەو هۆیانەی مرۆڤی خاوەن ژیر لەنەزانەکان و زیندەوەرەکانی تر جیادەکاتەوە ئەم چوارەن :

١ ـ تێگەیشتن ٢ ـ ژیری

٣ ـ دەروونی پاك ٤ ـ دادپەروەری

ـ پیاوی نەزان ئەگەر دەوڵەمەندیش بێ هەربەدبەختە لەبەرئەوەی بەنەزانی ماڵەکەی خەرج دەکات و بەبای دەدا، بەڵام پیاوی خاوەن ژیر ئەگەر هەژاریش بێ ئەقڵ و مێشکی سامانی ئەوە .

ـ بێ دەنگی لە ووشەی بێ کەلك باشترە .

ـ پیاوێکی فەلەك ناس لەگەڵ ئەوەی لەم بواردوە زانستێکی زۆری هەبوو، وەسیەتی کردبوو ئەگەر مردم لاشەکەم بسوتێنن و پاشان خۆڵەمێشەکەم بخەنە نێو کیسەیەك وە بیبەن بۆ بۆشایی ئاسمان، هەر لەوێ پەرت و بڵاوی بکەن، بۆ ئەوەی گۆڕم نەبێ و نەچمەوە دونیایەکەی ترو ئازار نەچێژم. نەزانی ئەم پیاوە لەوەدایە هەروا دەزانی ئازارو ئەشکەنجە لەلاشەدایە، بەڵام چی لەرۆحی دەکات

لەکاتێك هەرچی چێژو خۆشی و ئازار هەیە لە ڕۆحە، نەوەك لەجەستەی دوای مردن .

ـ بەزانست و ماڵ، ژیانت دادەمەزرێنی و پەرەی پێ دەدەی، نەوەك لەسەر نەزانی و دەست بەتاڵی.

ـ ئەگەر جوانی و دەوڵەمەندی نەزانی لەگەڵ بێ، بێ گومان ڕۆح ڕەش دەکات و سەرچاوەی سۆزیش ووشك دەکات .

ـ مرۆڤ تا دوای زانست بکەوێ زانایە، کە خۆی بەزانا زانی نەفامە .

ـ ئەوکارەی گورگ بەهێز دەیکات، ڕێوی بەفێڵ دەیکات .

ـ لۆمەو سەرکۆنەی ئەوکەسە مەکە کە لەژیان فێری ڵێ کردی، چوونکە ئەو بەسروشت لەتۆ زیرەکترە .

ـ ئەگەر هەموومان وەکو یەك بیرمان کردەوە، کەواتە بیرمان نەکردۆتەوە .

ـ لەگەنجی پیربە با لەپیری گەنج بی .

ـ نەزان بەدوای نەخشی بەر هەیوانە، کەچی خانوو لەبناغەوە وێرانە .

# ژیانی هەژاری و هەبوونی
## (( نهێنییەکانی ژیان، وەك تاریکیەکانی ژێر دەریایە))

سوڵتان دەگێڕێتەوە و دەڵێ : ئێمە خانەوادەیەکی پێنج کەسی و هەژارو کەم دەرامەت بووین، لەنێو گەڕەکێك لەگەڕەکە کۆنەکانی شاری شیراز ژیانمان بەسەر دەبرد، (کەمال ئەسکەندەری) باوکم کەسێك بوو لەنێو گەڕەکەکەمان جێ ی متمانەی هەموو خەڵك بوو، کەسێکی ئاین پەروەرو دینداربوو، ڕەفتار نەرم و قسەخۆش بوو، هەموو نوێژەکانی لەمزگەوت لەدوای ئیمام ئەنجام دەدا، کاتێك هاوسەرگیری لەگەڵ نەسرینی دایکم ئەنجام دا، لەخانەوادەکەی خۆی دابڕاو خانووەکی بچووکی بەکرێ گرت و لەگەڵ دایکم لەنێو ئەوخانووە ژیانیان بەسەر دەبرد، باوکم کرێکاری دەکردو ئەو پێداویستیەی بۆماڵەوە پێویستیان پێ هەبوو ئەوی جێ بەجێ دەکردو بڕەپارەکەی تریشی پاشەکەوت دەکرد، بۆکرێی مانگانەی خانووەکەو بۆدانەوەی قەرزەکەی، کە بەهۆی پێك هێنانی هاوسەرگیری قەرزاربببوو، توانی دوای چەند ساڵێك قەرزەکە بداتەوە، هەر لەو ماوەیەدا خودا دووکچی پێ بەخشیون ((عاتیفە)) و ((حەنانە)) عاتیفە بەچوار ساڵ لەحەنانە گەورەتربوو، دەگێڕنەوە لەکۆڵانەکەمان دەورو دراوسێکانمان ((عاتیفە و حەنانە)) یان دەبردەوەماڵەکانی خۆیان، وێنەیان لەگەڵ دەگرتن و بووکە شوشەو شتی تریان پێدەدان، لەبەر ئەوەی لەهەموو کیژۆڵانی گەڕەکەکەمان جوانترو قەشەنگتربوون .

ئەو ماوەیە باوکم پاشەکەوت کردنی ئەوجارەی بۆکڕینی خانوو بووە. هەر لەوکاتانەبوو من لەسکی دایکم بوومە، بەڵام بەرلەوەی من لەدایك بم، گەورەترین نەهامەتی ڕووی لەباوکم کردووە، جارێکیان لەکاتی کارکردنی،

لەسەر باڵاخانەیەکی چەند نهۆمی دەکەوێتە خوارەوە لەسەر لای پشتیەوە بەرزەوی دەکەوێت، ئەوانەی لەگەڵی کاریان دەکرد بەخێرایی گەیاندیانە نەخۆشخانە لەدوای پشکنینی پزیشکی، دەرکەوت کە بڕبڕەی پشتی لەچەند جێگایەك تووشی شکان و لادان بووە، ڕۆژی دواتر دەیهێننەوە ماڵەوە، لەسەر جێگا پاڵ دەکەوێ و تەنها بۆ دەست نوێژو نوێژکردن و نان خواردن هەڵدەستێ، بەڕاستی ئەوە سەرەتای نەهامەتیەکان بوو بۆخانەوادەکەمان، ئیتر باوکم توانای کرێکاریەتی نەما، من بەمانگ و نیوێك دوای ئەو ڕووداوە لەدایك بووم و هاتمە نێو تاقی کردنەوەکانی ژیانی دونیا، هەر لەگەڵ لەدایك بوونم خانەوادەکەم لەخۆشیان نەخۆشیەکەی باوکمیان لەیادچوو بوو، بەتایبەتی باوکم ووتوبووی : من نەخۆش نیم، چوونکە خوای گەورە دەسەڵاتێکی تری پێ بەخشیووم کە دواڕۆژ ببێتە جێگای ئومێد بۆئێوە، بۆیە ناوم نا ((سوڵتان)) دواتر داوای لەدایکم کردبوو شیرنی لەکۆڵانەکەمان ببەخشێتەوە. هەرچەندە هەندێ لەخزم و ئاشنایان ووتووبیان: ئەم منداڵە نەهامەتی بۆخانەوادەکەیانی هێناوە. بەڵام باوکم زۆر بەتووندی بەرپەچی دابوونەوەو پێیانی ووتبوو: ئێوە چۆن سووکایەتی بەدیاری خودا دەکەن، لەوە ناترسن خوا لەسەر ئەم قسە پڕووپووچانە توندترین سزاتان بدات ؟ مادەم خودا سوڵتانی بەمن داوە ئێستا باکم لەهیچ نەخۆشی و ناخۆشی نی یە.

باوکم لەگەڵ ئەوەش کە لەسەر جێگا کەوتبوو، بەڵام ئیمان و باوەڕی زۆر بەهێزبوو، هاندەربوو بۆ عاتیفە و حەنانەی خوشکم فێری زۆر شتی کردبوون، وەتوانی عاتیفە بنێرێتە قوتابخانە، ڕۆژانە لەماڵەوەش قورئانی فێردەکردو لەگەڵ بنچینەکانی ئیسلام، لەقوتابخانەش عاتیفە لەلایەن مامۆستاکانی زۆر

خۆشەویست بوو و دیاریان پێدەدا، لەبەرئەوەی لەهەموو قوتابیانی تر بەڕەوشت ترو جوانتر و زیرەکتربوو، کاتێك لەقوتابخانە دەگەڕایەوە ماڵەوە باوکم پێ ی دەووت : خانمی خانمان ئەمڕۆش لەقوتابخانە سەری باوکی بەرز ڕاگرت.

ئەو جۆرە قسە شیرینانە هاندەربوو بۆ عاتیفە کە زیاتر زیرەکی خۆی بسەلمێنێ، هەروەها باوکم بەهەمان شێوە گرینگی بەحەنانە دەداو ڕۆژانە فێری پیتەکانی دەکردو ئەویشی ئامادە دەکرد بۆقوتابخانە، بۆئەوەی وەك ((عاتیفە)) زیرەك و لێهاتو ببێ، باوکم بە ((حەنانە)) شی دەووت : شای کچان.

هەروەها زۆر دڵنەوایی دایکمی دەکرد، لەوماوەیەی ئەو کرێکارانەی کە لەگەڵ باوکم کاریان کردبوو سەردانیان دەکردین و چەند ساتێك بەدەوری باوکم دادەنیشتن، زۆر نیگەرانی حاڵی باوکم بوون، وە لەکاتی ڕۆیشتنیان زەرفێکیان بەجێ دەهێشت بەباوکمیان دەووت : ئەو دیاریەمان لێ قبوڵ بکە : دیارە بڕێکی پارەی تێدابوو وەك یارمەتیەك بەباوکمیان دەبەخشی، بەڕاستی ئەو بەڕێزانە زۆر نیگەرانی باوکمان بوونە، ئێستا زۆر پەرۆشی ئەوەم بیاندۆزمەوە کە سوپاسیان بکەم و دەستیان ماچ بکەم، نازانم ماون یان نا ؟ بەهەر حاڵ ئەگەر هیچ هەواڵێکم لەبارەیان دەست نەکەوێ، بەڵام لەدوعای خێر لەیادم نەکردونەو لەیادیشیان ناکەم، بەرە بەرە ئەوپارەیەی باوکم وەك پاشەکەوت بۆکڕینی خانووی دانابوو هاتە کۆتایی، پوورە مەعسومەو مامم ئەکرەم یارمەتی ئێمەیان دەدا، هەندێ لەدراوسێ یەکانمان وەك ماڵی ئاغا مورتەزاو زیباخانی خێزانی ئاگایان لەئێمە هەبوو ئەوانیش یارمەتیان دەدایـن، حاڵی باوکیشم ڕۆژ بەڕۆژ خراپترو بەئازارتر دەبوو، ئەوکات تەمەنم گەیشتبووە هەشت ساڵان هەستم

بەحاڵی باوکم دەکرد، ئەو ڕۆژەم لەیادە کەباوکم ((گەدە))ی تەقی، ئەوەش بەهۆی ئەوەی ئەو چەند ساڵە لەسەر جێگای نووستن دەرمانی چارەسەری بەکارهێنابوو، بۆئەوەی ئازاری پشتی کەم بکاتەوە، بەخێرایی دراوسێیەکان گەیاندیانە نەخۆشخانە، خەریك بوو باوکم بمرێ، بەڵام ئەوجارەش بەسەلامەتی هێنایانەوە ماڵەوە، پزیشکەکان ڕێنمایان کردبوو کە تەنها ڕۆژێ دووجار خواردنی شلە بخوات و نابێ وەك جاران دەرمان بەکاربێنێ، بۆئەوەی ئازاری بە ((گەدە))ی نەگا، لەگەڵ ئەوەی کە هاتە ماڵەوە خۆشحاڵ بووین، بەڵام ڕەنگ و ڕوخساری جارانی نەما، وەك جارانی پێشوو توانای قسەکردنی زۆری لەگەڵ ئێمە نەما، پێشتر لەسەر جێگا قسەوبەرهاتی خۆشی بۆ دەگێڕاینەوە و من و هەردوو خوشکەکەمی فێری نوێژی کردین، هەرسێکمانی بۆنوێژکردنی بەکۆمەڵ ڕادەگرت و نوێژی پێدەکردین، بەڵام ئەو نەخۆشە هێزو توانای لاوازکرد،ژانی پشت و ژانی گەدەی تینی بۆدەهێنا، تەنها توانای ئەوەندەی هەبوو لەسەر جێگایەکەی زیکرو ویردی خودا بکات،هەروەها نان خواردنیشی وەك جاران نەما،ڕۆژێ دووجاران شۆربای دەخوارد، دوای نان خواردن دەستی بۆ ئاسمان بەرزدەکردەوە سوپاسی خودای دەکرد، لەلایەکی ترەوە دایکم تا دەهات ڕەنگ و ڕوخساری دەگۆڕاو بێزاری و بێ ئومێدی خۆی لەوحاڵە دەردەبڕی، بەتایبەتی تووڕەییەکەی لەبەرامبەر عاتیفە و حەنانەی دەردەبڕی، هەر لەوماوەیە بوو خانەوادەی ناسیاوێك هاتنە خوازبێنی ((عاتیفە)) ئەوکات باوکم بەووردی پرسیاری لەبارەی ((نەژاد)) کرد وە لەنزیکەوە خۆی قسەی لەگەڵ کرد، کاتێك باوکم ڕەزامەندی خۆی نیشاندا، عاتیفەی خوشکم دەست بەجێ بە ووشەی ((بەڵێ)) وەڵامی دانەوە، عاتیفە ئەوکات تەمەنی ١٨ ساڵان بوو، حەزی

دەکرد خوێندنەکەی تەواوبکات، بەڵام لەبەر تووڕەیی و بێزاری دایکم خۆی لەوبارودۆخە ڕزگار کرد، لەگەڵ ((نەژاد)) ژیانی هاوسەرگیری پێك هێنا، نەژاد لەکارخانەیەك کار دەکات و لەخانەوادەیەکی ئایین پەروەرە، بەڕاستی لەگەڵ ڕۆیشتنی عاتیفە بارودۆخیماڵەوەمان ناخۆشتربوو، هەستم کرد تووشی جۆرێك لەتەنیایی بووم، چوونکە عاتیفە نازی من و حەنانەی ڕادەگرت، لەگەڵ من و حەنانە زۆر نەرم و نیان بوو، هەموو شەوانە وەك مامۆستایەك وانەی فێر دەکردین بۆئەوەی سبەینێ لەقوتابخانە وانەکان لەناخمان ئامادەبێت، بەڵام دایکم ئەوەندە بێزاری کرد ناچاربوو لەو تەمەنەی ڕەزامەندی خۆی لەسەر شووکردن دەرببڕێ .

نەهامەتیەکان بەرۆکی ئێمەی بەرنەدا، بەلای منەوە هیچ لەوە ناخۆشتر نەبوو، کە ئەوکات تەمەنم ١٠ ساڵ بوو، جارێکیان لەجیاتی حەنانەی خوشکم من چووم لەژووری چێشت لێنان خواردن بۆباوکم بێنم، لەپڕێك بینیم دایکم بەڕوخسارێکی تووڕە و چاوێکی تیژ سەیرم دەکات و لەجیاتی بڵێ : وەرە سوڵتان، ووتی : وەرە شەیتان ئەم قاپە شۆربایە بۆباوکە ئیفلیجەکەت ببە، کە دایکم ئەوقسەی لەڕووکردم بەو بچووکیەی خۆم هەستم بەگەورەترین ئازاری دڵ کردو هەمووگیانم کەوتە لەرزە، هەروام زانی هەموو دونیا بەسەرمدا ڕووخاوە، نەم توانی ووشەیەك لەزارم دەرببڕم، باوکی بەڕێزم بەئاغا ئەسکەندەری بانگ دەکرا، منیش بە ((سوڵتان))، کەچی باوکم ناونرا ئیفلیج منیش شەیتان، ئەی خودایە دەبێ لەم دونیا هیچ شتێ هەبێ لەقسەی ڕەق تیژتربێ دڵ و گیانی مرۆڤ شەت و پەت بکات ؟ کاتێك خواردنەکەم بۆباوکم برد، بینیم لەجێگایەکەی خۆی ڕاکشابوو زۆر بەئارامی دانیشت،

بەزەردەخەنەوە ووتی : سوڵتانی من! یاخوا ئەو دەستانەت ئازار نەبینێ! دیارە تۆ ئەمجارە خواردنت بۆمن هێناوە.

منیش زۆر بەزەییم پێهاتەوە و لەقوڵپەی گریانم دا، ئەویش لەجیاتی ئەوەی نان بخوا منی خستە باوەشی خۆی (( ووتی : سوڵتانی من تو خوا بەم فرمێسکانەت ئازاری زیاترم مەدە ! دەزانم دایکت بێزاری کردی! کوڕی خۆم، خۆت نارەحەت مەکە دوێنێ دایکت حەنانەشی تووڕەو بێزار کردبوو، بە حەنانەشم ووت : من و دایکت لەیەکتر تێدەگەین و هەموو شتێك چارەسەر دەگەین، کوڕی خۆم تۆ هێشتا تەمەنێکی درێژت لەپێشە، لەئێستاوە خۆت ڕادەستی غەمەکان مەکە، من دوعام بۆکردی کە خودا ژیانێکی پڕ لەخێرو خۆشیت پێ ببەخشێ، تۆ دەبێ کەسێکی چاك و کارامەت لێ دەربچێ، بۆ ئەم خانەوادەمان ببی بەجێگای ئومێدو سوودت بۆ ئەوان هەبێت. بەڕاستی ئەوقسانەی باوکم دڵ و گیانمی ئارام کردەوە، ڕۆژانە دوای عەسر ئاغا مورتەزا دەهاتە ماڵەکەمان لەگەڵ باوکم دادەنیشت و قسەی خۆشیان دەکرد، منیش دادەنیشتم و گوێم لەقسەکانیان دەگرت، بەڕاستی ئەوسات و کاتانە ڕوحێکی ئارام و دڵێکی خۆشم هەبوو، ئاغا مورتەزاو زیباخانی خێزانی بەڕاستی دراوسێ ی دڵسۆزبوون بۆئێمە، هەروەها ئەوکاتانەی دڵ و گیانم ئارام بوو ئەو وانە ئایینە بوو کە لەڕۆژانی پێنج شەممان ئێوارەکەی لەلایەن چەند مامۆستایەکی ئایینی لەمزگەوتەکەی گەڕەکەکەمان دەم خوێند، لەقوتابخانە هەرچەندە زیرەك بووم بەڵام هەستم بەئازارێکی دەروونی دەکرد لەبەرئەوەی لەهەموو قوتابیەکانی تر هەژارییم پێوە دیاربوو،هەروەها حەنانەی خوشکیشم کە ئەو لەقوتابخانەیەکی ناوەندی بوو،نیوەڕۆیان بەیەکەوە دەگەڕاینەوە ماڵەوە لەڕێگا

بێزاری بەڕووخساریەوە دیاربوو، ئێوارەیەکی پێنج شەممە لەوانە خوێندنی مزگەوت گەڕامەوە ماڵەوە بینیم حەنانە لەهەیوانەکە بەتەنیا دانیشتووە و زۆربە ئارامی دەگریا، منیش بەپەلە چوومە ژوورەکەی باوکم بینیم داپیرەم و خاڵم و دایکم لەدەوری باوکم دانیشتبوون، باوکم بەئارامی و زەردەخەنەوە بەئەوانی دەووت : من نامەوێ لەوە زیاتر ژیانی نەسرینی کچتان تاڵتر بکەم، من زۆر سوپاستان دەکەم کە لەڕابردوو قبوڵتان کرد هاوسەرگیری لەگەڵ نەسرینی کچتان بکەم، ئەوە بۆمن جێگای فەخرو شانازیە، سوپاس بۆخودا لەسەرەتا ژیانمان زۆر بەخۆشی دەستی پێکرد، بەڵام دواتر ژیانمان پێچەوانە بۆوە، بەڕاستی مرۆڤیش لەگەڵ کاری ڕۆژگار هیچی لەدەست نایەت، کاری ڕۆژگاریش هەمووی بەفەرمانی خودایەو ئەم حاڵەش لەم دونیایە بۆمن دانراوە و گەڕانەوەی بۆ نی یە، جا بۆیە لەلایەن خۆمەوە قبوڵمە نەسرین خان لەم ژیانە تاڵەی ئەمڕۆمان ماڵئاوایی بکات و ژیانێکی نوێ بۆخۆی فەراهەم بکات، وە من بەڕێزەوە بۆ نوێ بوونەوەی ژیان پیرۆزبایی لێ دەکەم، سەبارەت بەسوڵتان و حەنانە بەرپرسیارەتی بەخێوکردنیان و پەروەردەکردنیان لەسەر ئەرکی خۆمەو لای خۆم دەمێننەوە، ئەگەر خۆشم مردم سوپاس بۆخودا لەدوای خۆم مەعسومەی خوشکم بۆلای خۆی دەیانبات، بەڕاستی ئەو لەمن بەغەمترە بۆ منداڵەکانم. بینیم داپیرەم لەبەرخۆیەوە دەگریا، بەبێ هیچ قسەیەك لەگەڵ خاڵم و دایکم لەژوورەکە هاتنە دەرەوە، خاڵم و داپیرەم من و حەنانەیان ماچ کردو لەگەڵ دایکم هەرسێکیان لەبەر دەرگای ماڵەوەمان قسەیان دەکرد، پاشان ماڵئاواییان لەدایکم کرد، دوو ڕۆژ دواتر خاڵم هاتە ماڵەوەمان و دایکمی لەگەڵ خۆی بۆ دادگابرد، پاشان کە هاتنەوە پارێزەرێکیان لەگەڵ بوو، وەك نوێنەری

قازی هاتبوو کاغەزێکی بە باوکم واژووکرد و بەپێ ی یاسا دایکم تەڵاقدراو لەباوکم جیابۆوە و دووبارە ئەوان چوونەوە دادگا، بۆ نیوەڕۆیەکەی دایکم و خاڵم لەبازاڕ خواردنیان هێناو هاتنەوە ماڵەوەمان و لەگەڵ ئێمە دانیشتن، داوایان لێ کردین خواردنیان لەگەڵ بخۆین، کەچی من و حەنانە ئامادە نەبووین نانیان لەگەڵ بخۆین، بەڵام باوکم فەرمانی پێ کردین و ووتی : ڕێز لەدایك و خاڵتان بگرن و نانیان لەگەڵ بخۆن، ئێمەش لەسەر فەرمانی باوکمان تەنها لوقمە نانێکمان لەگەڵ خواردن، پاشان دایکم و خاڵم ماڵئاواییان لەباوکم کردو باوکم زۆر بەڕێزەوە لەژوورەکەی خۆی بەڕێی ی کردن، لەحەوشەکەمان دایکم بۆلای من و حەنانە هات، بەزەردەخەنەوە هەردووکمانی ماچ کردوو ووتی : سوڵتان گیان ئاگات لەباوکتان بێت : منیش ووتم : لەلای ئێوە من شەیتانم نەوەك سوڵتان، خاڵیشم بەهەمان شێوە ماڵئاوایی لێ کردین و هەردووکیان لەماڵەوەمان چوونە دەرەوە و دەرگای ماڵەوەیان داخست، ئای لەوڕۆژە ناخۆشە چی بوو ؟ وەك ئەوەبوو بەزیندوییەتی بۆ گۆڕستانمان ببەن و هەربەزیندوویەتی بمان خەنە نێو گۆڕ، من و حەنانە بەبێ ئومێدیەوە چووینەوە ژوورەکەی باوکمان و بەدەوری دانیشتین و لەقوڵپەی گریانمان دا، باوکیشمان زۆرتکای لێ کردین ئارام بینەوە، هەر لەوکات و ساتە لەدەرگادرا، کەچووم دەرگام کردەوە، بینیم ئاغا مورتەزای دراوسێمان لەگەڵ زیباخانی خێزانی هاتنە ژوورەوە و منیان ماچ کردو ووتیان: غەمبار مەبە سوڵتان گیان، ئێمە لەجێگای دایك و باوکتانین، بینیم ئاغا مورتەزا لەگەڵ باوکم بەزەردەخەنەوە سەیری یەکتریان کرد و پاشان بە تەنها کەوتنە قسەکردن لەگەڵ یەکتر. ڕۆژانە زیباخان دەهاتە ماڵەوەمان و خواردنی بۆساز دەکردین،

هەروەها مەعسومەی پوورم هەفتەی دووڕۆژ دەهاتە ماڵەوەمان، بەڕاستی هەستمان بەبێ دایکی نەدەکرد،

کاتێك هەواڵی جیابوونەوەی دایکم بە عاتیفەی خوشکم گەیشت، لەگەڵ ((نەژاد))ی مێردی و مناڵە کۆرپەکەی بەگریانەوە هاتەوە ماڵەوە، دەستی باوکمی ماچ کردو زۆر قسەی ناشیرینی لەبارەی دایکم دەربڕی، بەڵام باوکم بێ دەنگی کردو ووتی : کچی خۆم هەرچۆنێك بێ دایکتە، ئەومافەت نی یە بەم شێوەیە سووکایەتی پێ بکەی، تەنها ئەوەیە ئەو بەرگەی ئەم حاڵەی منی نەگرت، ئەگینا هیچ تاوانێکی نی یە. بەهەرحاڵ عاتیفە ئارام بۆوە.

نەژادو عاتیفە ئامادەیی خۆیان دەربڕی کە ئەوانیش لەلایەن خۆیانەوە کۆمەکیمان بکەن، دوای نزیکەی شەش مانگ دایکم شووی بەفائیق ی کۆنە دراوسێکەمانی کردبوو، نزیکەی دوومانگ پێش مارەکردنەوەی دایکم، فائیق ی کۆنە دراوسێ ماڵی بارکردبوو، ئەوکات هەستم کرد ئەو دراوسێیەمان بەرنامە ڕێژی لەگەڵ دایکم کردووە بۆ هاوسەرگیری، چوونکە چەند جارێك بینیم فائیق بە ئۆتۆمبێلەکەی لەبەر دەرگای ماڵەوەمان دەوەستاو بەگەرم و گوڕی سڵاوو ئەحواڵپرسینی لەگەڵ دایکم دەکرد، وا هەستم کرد ئەو فائیقە سوودی لەنەخۆشی و لاوازی باوکم وەرگرتووە و دایکمی فێرکردووە لەماڵەوە باوکم بێزاربکات و ناچاری بکات دەست لەدایکم هەڵگرێ و تەڵاقی بدات، ئەو جۆرە مرۆڤانە خوێنی گورگ لەنێو جەستەیان هاتوو چۆدەکات، خۆزگە ئەو جۆرە مرۆڤانە لەڕیزی مرۆڤایەتی دەچوونە دەرەوە و خۆیان دەگەیاندە نێو گەلە گورگەکان، چوونکە ئەوێ شوێنی ئەوانە، کاری گورگیش شپرزەکردنی مەڕوماڵاتە، ئەو گورگەش شیرازەی خانەوادەکەی ئێمەی تێك و لێکدا، ئەو

ڕۆژەم لەیادە عاتیفە لەگەڵ نەژاد هاتەوەماڵەوە لەپڕێك بەگریانەوە هاتە حەوشی ماڵەوەمان و بەبێ سڵاوکردن ووتی : من دەزانم ئەو بێ شەرم و بێ حەیایە شتێکی لەژێر سەردایە، ئەوە چ دایکێکە ئێمە هەمان بوو ؟ خۆزگە لەژنە قەرەجێکی قەفقازی لەدایك بووینایە، نەك لەودایکە نەفس نزم و بێ حەیایە ! یاخوا قەت خێر لەخۆی نەبینێ ! باوکیشم لەژێر هەیوانەوە زۆر بەئارامیەوە ووتی : کچی خۆم توخوا بەم شێوازە ئازارم مەدە، جوێن دان بەدایکت جوێن دانە بەمن، تۆ سەرەتا سڵاوێکمان لێ بکە ئینجا قسەم بۆ بکە، عاتیفە بەگریانەوە بەرەولای هەیوانەکە چوو دەستی باوکمی ماچ کردو لەپاڵ ئەو دانیشت و ووتی : باوکەگیان ئەوە چ دڵێکە تۆ هەیتت ؟ ئەو نەرم و ئارامیەی تۆیە وای لەئێمە کردووە لەبارەی مافی خۆشمان بێ دەنگ بین و قسە نەکەین، باوکەگیان توخوا بۆمنیان لێ گەڕێ سبەی خۆم دەگەینمە دادگا سکاڵایان لەسەر تۆماردەکەم، دەبێ پەل کێشی دادگایان بکەم و لەنێو هۆڵی دادگا ئابڕوویان ببەم ! باوکم بەزەردەخەنەوە ووتی : کچی خۆم لەدادگای خودا ڕێگا بەمرۆڤەکان دراوە بەسەربەستی ژیان بۆخۆیان هەڵبژێرن، چۆن دەبێ بچینە دادگای مرۆڤەکان و لەوێ سکاڵا لەسەر دادگای خودا تۆماربکەین ؟ بالێیان گەڕێین بۆخۆیان بەسەربەستی ژیان بەسەر ببەن، ئێمە هیچ سوودێك لەوسکاڵایە وەرناگرین، تەنها هات و هەڵاو دەمەقاڵێ دەکەوێتە نێوانمان، وە ئەگەر دادگا هەر ئیجرائاتێك بەرامبەر دایکتان بکات، بەڕاستی بۆئێمە ئابڕوچوونێکی گەورەیە، بۆیە کچی خۆم تکات لێ دەکەم واز لەم بۆچوونە بهێنە، هەموو ئەوکارانە ڕادەستی قەدەری خودا دەکەین، ئومێد دەکەم چۆنی بۆئێمەو دایکتان خێری تێدایە هەروا ببێ.

عاتیفە بەگریانەوە سەری تەکاندو ووتی : فەرمانت بەجێ یە باوکەگیان. دواتر نەژادو باوکم و عاتیفە لەبارەی من و حەنانە و بەردەوامیمان لەسەر خوێندن قسەیان کرد، نەژاد بڕیاریدا خەرجی تەواوی قوتابخانەمان بخاتە سەر ئەرکی خۆی، بۆئەوەی بەردەوام بین لەخوێندنمان، سوپاس بۆخودا کە دەرگای قوتابخانە کرایەوە لەساڵانی پێشتر گەرم و گوڕتر بووین لەسەر خوێندن، من لەقۆناغی پێنجەمی سەرەتایی بووم و حەنانەی خوشکیشم لەقۆناغی پێنجەمی ناوەندی بوو، قوتابخانەکان زۆر لەیەکتر دوورنەبوون، لەکاتی چوون و گەڕانەوەمان بەیەکەوە دەگەڕاینەوە ماڵەوە، لەوماوەیە ماڵەوەمان کەشێکی ئارامی بەخۆیەوەبینیبوو، ئاغا مورتەزا دوای عەسر بەردەوام بوو لەسەردانەکەی بۆماڵەوەمان، شیعرەکانی حافزو سەعدی شیرازی زۆر لەبەرکردبوو، زۆر بەخۆشی دەیخوێندەوەو ماناکەشی زۆر بەجوانی لێك دەدایەوە، بەڕاستی دانیشتن لەگەڵ دانایان و خاوەن ژیران خۆشیەکی نەبڕاوەیەو بەزار پێناسە ناکرێ ،

بەڕاستی ئاغا مورتەزا دۆستێکی ڕاستەقینەی خانەوادەکەمان بوو، زۆر باوکمی خۆشدەویست بەباوکمی دەووت : ئاغای ئەسکەندەری تۆ دڵت لەدڵی من فراوانترە، منیش زارم لەزاری تۆ فراوانترە، کەواتە دەبێ مامەڵەیەك بکەین و هەردووکمان لەسەری ڕێك بکەوین، تۆ بەم دڵە فراوانەت سۆزوئارامی بەمن ببەخشە! منیش بەم زارو زوبانەم داناییت پێ دەبەخشم، پوورە مەعسومە هەفتانە بەردەوام بوو لەسەردانی بۆماڵی ئێمە هەروەها عاتیفەخانی خوشکیشم لەنێوان دووهەفتە شەوێك لەماڵەوەمان دەماوە، بەڵام نەیدەتوانی زیاتر بمێنێتەوە، ئەمەش بەهۆی منداڵە بچووکەکەی سەرقاڵ بوو، هەروەها نەژادیش

بەکارخانـە، چـوونکە نـەژاد سەرپەرشـتی کرێکارەکـانی نێـو کارخانـەی دەکـرد، بەڕاستی ڕۆژ بەڕۆژ ناوو ڕوخساری دایکمان لـەبیروهۆشمان دەردەچـوو، چـوونکە پوورە مەعسومەو زیباخانی دراوسـێمان و عاتیفـەی خوشـکم بـەزیادەوە جێگـای ئەویان بۆ ئێمە گرتبۆوە. بەڵام ئێمە تاقی کردنەوەیەکی زۆرمان لـەپێش مـابوو نەهامەتیەکان بەرۆکی ئێمەی بەرنەدا، هەرلەوماوەیەبوو ڕۆژێکیان بەیانیـەکەی بەرلەوەی بۆ قوتابخانە بچین، باوکم لەتاو ژانی گەدەی دەینالآند، منیش بەپەلە چوومە ماڵی ئاغا مورتەزای دراوسێمان و هەواڵم پێدا، ئەویش خۆی و زیبـاخـان بەپەلـە بۆماڵـەوەمان هـاتن، ئاغـا مورتـەزا ووتـی : ئێـوە بـڕۆن بـۆ قوتابخانـەو نیگەرانی باوکتان مەبن، من خـۆم هەرئێـستا دەیگەیـنمـە نەخۆشـخانە، ئـای لـەو ڕۆژە تاڵە چی بوو، من و حەنانە بەڕۆح و دڵێکی پڕ لەغەمەوە بەرەو قوتابخانە چووین، ئـەو ڕۆژی بیروهۆشـم لەلای خوێنـدن و وانـە نـەبوو، ئەگـەر ئـەو ڕۆژە ڕۆژی تاقی کردنەوەبوایە بێ گومان تەنانەت یـەك نمرەشـم بەدەسـت نـەدەهێنا، بەر لەنیوەڕۆی ئەورۆژی لەکاتی وانەی ((وێنـەو نیگـا)) کێشاندابووین، لـەپڕێك مامۆستا ((مینا)) کە مامۆستایەکی زۆر بەسـۆزو میهرەبـان بـوو بۆقوتابیـان، بـۆ هەمووومان وەك دایکێك بوو، کە هاتە ژوورەوە لەڕوخساری غـەمێکی زۆر بـەدی دەکـرا، چـەند ووشـەیەکی بـەگوێی مامۆسـتاکە چـرپاندو دەسـت بـەجێ هـەردووکیان بانگیـان کـردم، منـیش بـەترس و لـەرزەوە بـۆلای ئـەوان ڕۆیشتم، مامۆستا مینا دەستی خستە سەرشانم و ووتی : کوڕی خۆم با بەیەکەوە بڕۆیین، منی لەگەڵ خـۆی سـواری ئۆتۆمبێلەکەی کـردو ووتـی : دەبـێ بـچین حەنانـەش لەگـەڵ خۆمـان بێـنین و بـچین بـۆ نەخۆشـخانە، لەبـەر ئـەوەی باوکـت کـەمێك نارەحەتـەو دەیـەوێ ئێـوە سـەردانی بکـەن، منـیش لەبـەر خۆمـەوە فرمێـسکم

دەباراند، کاتێك حەنانەمان لەقوتابخانەی ناوەندی هێنا دەرەوە، لەقوڵپەی گریانی داو ووتی : ماموستا توخوا باوکم چی بەسەر هاتوە ؟ ماموستا بەدەم ڕۆیشتنەوە بەئۆتۆمبێلەکەی لەقوڵپەی گریانی داو ووتی : باوکتان ماڵئاوایی لێ کردن. نازانم چۆن پێناسەی ئەو ڕۆژەتان بۆبکەم ؟ لەفرمێسك باراندنی وەك بارانی بەلێزمە هیچمان پێ نەدەووترا، ماموستا مینا ئێمەی بەرەو ماڵەوە بردەوە و دواتر چووین بۆلای مزگەوتەکەمان، بینیمان قەرەباڵغیەك لەبەر دەرگای مزگەوتەکەیە، هەموو مامەکانم لەگەڵ پوورە مەعسومەو عاتیفەی خوشکم بەگریانەوە بەدەوری تەرمەکەی باوکم دانیشتبوون ماچیان دەکرد، ئاغا مورتەزا بەگریانەوە لەپشتمان وەستابوو دەیووت : خوات لەگەڵ کەمال ئەسکەندەری، بەڕاستی دۆستێکی خواناس و ڕاستەقینە بووی، بڕواناکەم جارێکی تر دۆستێکی وەك تۆم دەست بکەوێتەوە، ئەو ڕۆژە باوکم گەدەی لێك هەڵوەشابۆوە، پزیشکەکان بەوە ڕانەگەیشتبوون چارەسەری بکەن و دەست بەجێ گیانی سپاردبوو، ڕۆژی دواتریش پوورە مەعسومە حاڵی تێك چوو بەزوویی گەیاندیانە نەخۆشخانە، دوای تەواوبوونی پرسەکەی باوکم هەموو مامەکانم کەوتنە گفتووگۆ لەسەر حاڵی من و حەنانە، هەرچەندە باوکم پێشتر وەسیەتی کردبوو کە دەبێ بچینە لای پوورە مەعسوومە، بەڵام ئەوکات پوورە مەعسومە لەنەخۆشخانەبوو، بۆیە مامەکانم بەچاکیان زانی یەکێ لەنێوخۆیان ئێمە بباتەوە لای خۆی، مامم ئەکرەم زۆری هەوڵدا، کە بەڕاستی لەنێو مامەکانم ئەو لەهەموویان بۆئێمە چاکتربوو، بەڵام ((فەزل))ی مامم کە برا گەورەی هەموو مامەکانم بوو، ئەوبڕیاری دا ئێمە بباتەوە ماڵی خۆیان، بەڕاستی زۆرم پێ سەیربوو، فەزڵی مامم لەپێشتر لەغەمی ئێمەدا نەبوو، ئێستا بۆچی

پەرۆشی من و حەنانەیە ؟ دواتر زانیم چ بەرژەوەندیەکی تایبەت بەخۆی هەیە، ئەوکات مامەکانم بەدوای خاوەنی خانووەکەیان ناردو کلیلی خانووەکەیان داوە دەست خۆی، بەڕاستی زۆر ناڕەحەت بوو بەمردنی باوکم، وە ئەویش بڕێکی لەکرێ ی خانوەکەی لەسەرمان هەڵگرتبوو،

من و حەنانە لەگەڵ مام فەزڵ ڕۆیشتین، مامم فەزڵ پەیمانی پێداین کەوەك منداڵەکانی خۆی مامەڵەمان لەگەڵ بکات، ئەوکات بەرەو تاقی کردنەوەی کۆتایی ساڵ دەڕۆیشتین، ئەوساڵی هەردووکمان سەرکەوتوو بووین، من بووم بەقۆناغی شەشی سەرەتایی، حەنانەش شەشی ئامادەیی، ئەوماوەیە پشووی قوتابخانە بوو، نزیکەی دوومانگ تێپەڕی، هەستم کرد ماڵەوی مامم تەنها زیاتر گرینگی بەحەنانە دەدەن، زۆر ڕوویان لەمن وەردەگێڕا، ڕۆژێکیان بینیم چەند ئافرەتێك بەئۆتۆمبێلێکی نوێ، بۆماڵەوەی مامم هاتن،لەلایەن ماڵەوەی مامم زۆر بەرێزەوە پێشوازیان لێ کرا، لەدوای کەمێك دانیشتن و کەوتنە باسی خوازبێنی حەنانەی خوشکم، چەند ڕۆژێك پێشتر هەستم دەکرد حەنانە غەمبارەو چەند جارێك بینیم فەزڵی مامم بەتەنها گفت و گۆی لەگەڵ دەکات، ئینجا زانیم هاتنی ئەو میوانانە پەیوەندی بەگفت و گۆی نێوان مامم و حەنانەوە هەیە، مامۆژنم و میوانەکان بەدەوری حەنانەوە دانیشتبوون و قسەیان بۆ دەکرد، دواتر بینیم وێنەیەکیان دەرهێنا بە ئەویان نیشان دەدا و هەوڵی ڕازی کردنیان دەدا. بەر لەڕۆیشتنیان دەنگی شادیان هەڵبڕی وادیاربوو حەنانە ڕەزامەندی خۆی دەربڕیبوو، پاشان میوانەکان ڕۆیشتن و حەنانە هاتە لام و ووتی : سوڵتان من ڕازی بووم بەوەی کە شوو بە (حیسام) بکەم، چوونکە ئەگەر ڕازی نەبم دواتر بەمانەوەم ئەکەومە بەرسووکایەتی و تووڕەیی مامم و

مـامۆژنم، ئێمـه لـەڕابردوو بەرگـەی سـووکایەتی دایکـی خۆمـان نـەدەگرت، ئـەی چۆن ئێستا بەرگەی سووکایەتی مام و مامۆژنم بگرین ؟

سەبارەت بەتۆش دەبێ ڕێگه چارەیەك بۆتۆش بدۆزینەوە، ئەگەر حـەزت کـرد ڕەوانەی لای پووره مەعسومەو ئارینای کچی پووره مەعسومەت دەکەم،

منیش دەستم بەگریان کردو ووتم : توخوا حەنانه بەجێم مەهێڵە !

من بەرگەی دووری تۆ ناگرم !

حەنانه منـی لەباوەشـی خـۆی گـرت و ووتـی : مـن کچم و نـاتوانم هـەر ڕۆژێ لـەماڵێك ژیـان بەسـەر ببـەم، بەڕاسـتی نامـەوێ سـووکایەتیم پـێ بکـرێ، ئەگـەر تۆمەتی بچووکیش بدرێته پاڵ کچ، بەتـەواوەتی لـەنێو خـەڵك ئـابڕووی دەچـێ، ئێـستاش مـن و تـۆ لێـره وەك ئـاوارەین، دەزانم مـامم کەسـێکی دڵ ڕەقـە، وە بەرژەوەندی خۆی لەشووکردنی من دەبینێ، وە منی داوەته مـاڵێکی دەوڵەمەنـد، بەڵام سوپاس بۆخودا ئەو کوڕە لاوەی کە من شووی پێدەکـەم، کوڕێکی دینـدارو ئـایین پــەروەرەو قوتـابی کۆلیـژی پەروەردەیـە، تەمـەنی بیـست سـاڵەو تـەنها دۆسـتایەتی کەسـانی دینـدارو ئـایین پــەروەر دەکـات، وە کـەس و کـاری تـازه پـەیمانیان پێـدام کـه بـەردەوام بم لەخوێنـدن. بەهـەرحاڵ شـەوی هـەینی بـه ئامادەبوونی عاتیفـەی خوشـکم و مامـەکانم، حیـسام و دایـك و بـاوکی و هەنـدێ لـەخزمانیان و لەگـەڵ مامۆسـتایەکی ئـایینی هـاتن و ڕێ و ڕەسمـی مـارەکردنی حەنانه بەڕێوه چوو،دوای ڕۆیشتنی ئەوان حەنانه لـەبارەی دواڕۆژی مـن قـسەی کرد، دەست بەجێ مامم فەزڵ بەقسه گەورەکانی کەوته گفتوگۆکردن و ووتـی : دڵنیابن سوڵتان لەلای مـن دواڕۆژێکـی گەشـی دەبـێ، نامـەوێ کەسـتان نیگـەرانی سوڵتان ببن، لەمەودوا لای ئێمه بەڕێزترو خۆشەویستر دەبێ، فـەزڵی مـامم بـەم

قسە گەورانە هەموویانی دڵخۆش کرد، دوای دووهەفتە حەنانە بەرگی بووکێنی لەبەرکراو گوازرایەوە، ئەو ڕۆژەی وام دەزانی حەنانە بەرگی کفنیان لەبەر پۆشیوە و بۆ گۆڕستانی دەبەن، پڕ بەدڵ حەزم دەکرد خودا گیانم لێ بسێنێتەوە و کۆتایی بەم ژیانە پڕ لەنەهامەتیەم بێت، چوونکە من لەو ڕۆژەوەی کە تەرمی باوکم بینی کە چ ڕوخسارێکی جوان و بێ ماندووبونی پێوە دیارە، ئینجا زانیم مردن بۆ هەندێ کەس ئارامی بەگیانی دەبەخشێ، هەرچەندە داوام لەخودا کرد گیانم لێ وەرگرێتەوە، بەڵام دانایی و بەخشندەیی خودا زۆر لەوە گەورەترە کە ئێمە بڕیاری لەسەر دەدەین، چوونکە مرۆڤەکان نازانن دوارۆژ چی دێتەوە پێشیان و ژیانیان بەرەو کوێ هەنگاو دەنێ .

بەهەر حاڵ جۆرە تەنیاییەکی تر ڕووی تێکردم و منیش ڕاهاتبووم لەو جۆرە ژیانە، دوای ڕۆیشتنی حەنانە بەدوو هەفتە، مامم فەزڵ ئۆتۆمبێلێکی گران بەهای وەك دیاریەك لەماڵەوەی حیسام پێ بەخشرا، وەلە کۆمپانیا لەجێگایەکی چاکتریان داناو مووچەیەکی چاکتریان بۆ بڕیەوە، ئینجا زانیم مامم کە ئێمەی بردە لای خۆی، تەنها بۆفرۆشتنی حەنانەی خوشکم بوو، ئەو سوودی لەقەشەنگی و جوانیەکەی حەنانە وەرگرتووە و بەماڵی دەوڵەمەندێکی فرۆشتووە، دوای مانگێك تەنها جارێك ماڵەوەی حیسام حەنانەیان هێناوە ماڵەوە، لەکاتی ڕۆیشتنیان حەنانەو حیسام ووتیان: هەرکات حەزت کرد وەرە ماڵەوەمان، بینیم حیسام کەسێکی زۆر ڕووخۆش و زمان شیرینە بەڕاستی ئەو لەنێوان برایەکانی لەهەموویان چاکترو بەڕێزترە. ئەوماوەیەی لەماڵی مامم هەستم کرد لەدوای ڕۆیشتنی حەنانە ڕۆژ بەڕۆژ بەقسەی ڕەق و ڕەفتاری تووند مامەڵەم لەگەڵ دەکەن، هەرچەندە زۆری کارەکانی ماڵیانم ڕادەپەڕاند، بەڵام

بینیم وەك بەندەو كوێڵەك سەیرم دەكەن، تەنها دوو هەفتە مابوو پشوو كۆتایی پێ بێت و دەرگای قوتابخانە بەڕووی قوتابیان بكرێتەوە، هەستم كرد هەڵس و كەوتی ماڵەوەی مامم لێ ناگەڕێ لەخوێندن سەركەوتوببم، بۆیە بیرم لەوە كردەوە بچمە لای حەنانەی خوشكم سەبارەت بەحاڵی خۆم ڕاوێژی لەگەڵ بكەم، هەرچەندە پێم خۆش نەبوو لەدەرگای ماڵی دەوڵەمەندان بدەم، بەڵام بۆ بینینی حەنانەی خوشكم ناچار بووم ئەوكارە بكەم، كاتێك چوومە ئەو گەڕەكەی ماڵی حیسام و حەنانەی تێدایە، بەپێ ی ناونیشانەكەی لام بوو، كەگەیشتمە بەردەرگای ماڵەوەیان بینیم كۆشكێكی گەورەیە زۆر لەخانوو كۆشكەكانی دەوروبەری گەورەترو ڕازاوەترە، كاتێك زەنگم لێدا، هەستم كرد هەموویان لەنێو باغچەی ماڵەوەیان دانیشتوون، لەپڕێك (قاسم) ی برا گەورەی (حیسام) لەگەڵ باوكی دەرگایان كردەوە، زۆر بەناشرینی سەیریان كردم و ووتیان : لێرە مەوەستە.

منیش ووتم : هیچ كارێكم بەئێوە نی یە تەنها دەمەوێ حەنانەی خوشكم ببینم و بڕۆم، قاسم دەست بەجێ بەرەو ڕووم هات و بەبێ ویژدانی لێیدام، عارف ی باوكی بەتوڕەییەوە دەیووت : ئەگەر لێرە بوەستی تەلەفۆن بۆ پۆلیس دەكەم بتخەنە زیندان، لەپڕێك حیسام هاتە دەرەوە منی لەبەردەستی قاسم ی بێ ویژدان دەرهێناو ووتی : بێ ویژدانینە ئەم منداڵەش وەكو ئێمە مرۆڤە، خۆ چی لەئێمە كەمتر نی یە، بەبێ ویژدانی و لووت بەرزی مامەڵە لەگەڵ ئەم منداڵە دەكەن ؟ بەچاوی خۆتان ببینن خودا چیتان بەسەر دێنێ !

بەڕاستی حیسام تاكە كەس بوو لەو ماڵە، كە ئەوەندە میهرەبان و بەئەمەك بێت، دەستی لەملی من كردو منی بەرەو شەقامی گشتی برد، بەدەم ڕۆیشتنەوە

ووتی : سولتان گیان دوێنێ شەڕێکی گەورەم لەگەڵ قاسم کردووە، وە بەتوندی هەڕەشەم لێ کردو پێم ووت : بەهەر جۆرێك قسە لەبارەی ژیانی من و حەنانە بکەیت، بەشێوەیەك ئاگر لەم کۆشکە بەرئەدەم کە کەسمانی لێ ڕزگار نەبێت، بۆیە باوکم و برایەکانم ترسان و ووتیان : پەیمانتان پێ دەدەین کارمان بەژیانی ئێوە نابێت، ئەوە تووڕەبوونی دوێنێیە ئەمڕۆ بەتۆیان دەرکرد، بۆیە داوای لێبوردنت لێ دەکەم کە نەمتوانی لەگەڵ خۆم بۆ ژوورەوەت ببەم، بەڵام ئێستا ڕەوانەی ماڵی پوورە مەعسومەت دەکەم هەر ئەمڕۆ دوای عەسر من و حەنانە دێینەلات، ڕێگە چارەیەك بۆ حاڵی تۆ دەدۆزینەوە. بەڕاستی منیش وەکو تۆ تەنها حەنانەم هەیە کە دڵم پێ ی خۆش بێت، تۆ خانەوادەکەت نەماون، کەچی من دایك و باوك و خوشك و برایەکانم زیندوون، بەڵام هەست بەبوونیان ناکەم، ئەوەی ئێستا لەو کۆشکەمان خۆشحاڵم دەکات بەتەنها حەنانەی خوشکتە، بەڕاستی لەمانای ژیان تێگەیشتووە، لەم ماوە کەمەی لامە فێری زۆر شتی کردوومە، دوێنێ بەمنی ووت : حیسام من ڕازی نابم هەڵسووکەوتی توندو هەڕەشەکردن لەماڵەوەت بەکاربێنی، ئەگەرچی ئەوان بەرامبەرمان توونديش بن، دەبێ ئەوان لەئێمەوە فێری نەرم و نیانی و هەڵوێستی جوان ببن. بەهەرحاڵ ئەوکات حیسام ئۆتۆمبێلێکی بەکرێ گرت و منی ڕەوانەی ماڵی پوورە مەعسومەی کرد، کە گەیشتمە ماڵی پوورە مەعسومە مێردی پوورم لەماڵەوە نەبوو، تەنها ئارینای کچی لەماڵەوە بوو، کە منی بەم حاڵەوە بینی زۆر نیگەران بوو،

ووتی : دایکم لەژوورەوە لەسەر جێگایەو نەخۆشە، دوو ڕۆژ بەر لەئێستا لەنەخۆشخانە هێنامانەوە، لەوەتەی باوکت مردووە سێ یەمین جارە بیبەینە

نەخۆشخانەو بیخەوێنین، ئێستاش ناوێرم تۆ ببەمە لای ئەو، لەوە دەترسم بەم حاڵەوە بتبینێ و دڵی ڕابوەستێ ! ئارینا دەستی لەسەر شانی دانام ووتی : وەرە لەگەڵم دەست بەجێ منی بردە ماڵی دراوسێیەکەیان هەر لەوێ خۆی تەلەفۆنی بۆ ماڵی (عاتیفە) ی خوشکم کردو حاڵی منی تێگەیاند .

عاتیفە دەنگی گریانی لەتەلەفۆنەکە دەردەچوو ووتی: ئاریناخان توخوا هەر ئێستا ناونیشان و ژمارە تەلەفۆنی ماڵەکەمان بدە بەشوفێرێك و سوڵتانیش لەگەڵ ڕەوانە بکە بۆلای من، کاتێك گەیشتمە لای ماڵی عاتیفە، بینیم عاتیفە لەبەر دەرگا چاوەڕوانی هاتنم دەکات، کە لەئۆتۆمبێلەکە هاتمە خوارەوە بەرەو ڕووم هات، منی لەباوەشی خۆی گرت و ووتی: ئەی بەقوربانی ئەم دڵە غەمبارو ڕەنجاوەت بم، مەگەر من مردووم کە تۆ بەبێ کەسی بژی ؟

برایەکەم بینیت نەخۆشی چۆن باوکمانی لەناوبردو هەژاریش دایکمانی لێ جیاکردینەوە و مامی بێ ویژدانیش حەنانەی لێ فرۆشتین!

منیش لەباوەشی خوشکم وەك منداڵێکی ساوا دەگریام.

عاتیفە ووتی : سوڵتانی من دڵنیات دەکەمەوە و پەیمانت پێ دەدەم لەمەودوا غەم و پەژارەی ساڵانی ڕابردووت هەموو لەبیر دەبەمەوە، ئەگەر گیانی خۆم کردبێتە قوربانی دەبێ ئەوکارە هەربکەم !

ئای ئەو قسەو پەیمانەی عاتیفە چ ئارامیەکی بەدڵ و گیانم بەخشی، زۆر خۆشحاڵ بووم، چوونکە زانیم پەیمانەکەی دەباتەسەر.

ئەو ڕۆژی بۆ ئێوارەکە، (نەژاد) هاتەوە ماڵەوە و زۆر خۆشحاڵ بوو بەهاتنی من بۆ ماڵەوەیان،

ووتی : سوڵتان گیان من چەند ڕۆژێك بەر لەئێستا داوام لە عاتیفەخان کرد کە تۆ بێنین بۆ ماڵەوەی خۆمان،

بەڵام عاتیفەخان ووتی : بابزانین ئەوماوەیە ماڵەوەی مامم لەگەڵ سوڵتان چۆن دەبن، بەهەر حاڵ زۆرخۆشحاڵین بەهاتنت، ئیتر ئێرە ماڵەوەی خۆتەو هەمیشەدەبێ لەگەڵ خۆمان بژی، لەبەیانی یەوە لەگەڵ خۆم بۆکارخانەت دەبەم، هەروەها وادەکەم لەخوێندنەکەت بەردەوام بی بەپشتیوانی خوا ناوت دەخەمە نێو نزیکترین قوتابخانە، کەلەخۆمان نزیك بێت .

بەڕاستی (نەژاد) بەیەکجاری خۆشحاڵی کردم .

هەر ئەو شەوە عاتیفە و نەژاد ژوورێکی ماڵەوەی خۆیان بەجوانی ڕازاندەوە، زۆر بەرێزەوە ووتیان: ئەم ژوورە تایبەتە بەخۆت و ماڵی تۆیە !

کە چوومە ژوورەوەو پاڵکەوتم، هەستم بەشادومانی و ئاسوودەیی کرد، زانیم لەمەودوا نەهامەتیەکان بەرۆکم بەردەداو ژیانم گۆڕانکاری بەسەردێت، ئەوە یەکەم شەوبوو لەژیانم خەوێکی خۆشی تێدابکەم .

کاتێك لەگەڵ بانگی بەرەبەیان لەخەو هەستام هەروام دەزانی من ئەو شەو بووم بە پاشای ئەم ووڵاتە.

لەگەڵ نەژاد بۆ مزگەوت چووین، کەش و هەوای نێو مزگەوتیش ڕۆحیەتێکی تری بەمن بەخشی، کە گوێم لەقورئان خوێندنی ئیمامەکە بوو لەقوڵپەی گریانم دا، گریانێکی پڕ لەشادی نەم زانی چۆن نوێژەکەم تەواوکرد، لەدوای نوێژ هەموو نوێژخوێنان بەئیمامەوە سەیریان دەکردم، کەسیان نەیان دەزانی ئەم گریانە بۆ چی یە، تەنها نەژاد دەیزانی مانای ئەم فرمێسکانە چی یە. ئەو

ڕۆژی لەگەڵ نەژاد بۆکارخانە چووم. یەکەم ڕۆژبوو بەرەو کارکردن بڕۆم، نەژاد لەنێو کارخانە منی بەهەموو کرێکاران و کارمەندان ناساند و منی بردە لای ئاغا ستار کە ئەویش سەپەرشتکاری کارخانەبوو، ئەوتەنها بەشەو سەرپەرشتیاری دەکردو نەژادیش بەڕۆژ، هەردووکیان بەیەکەوە منیان بردە لای گشت کرێکارەکان.

ووتیان : سولْتان، کاری بەردەستی ئێوە ڕادەپەڕێنیّ و هەرکەسیّ کارێکی تایبەت بەخۆشی هەبوو بەسولْتان بلْێت و بۆی ئەنجام دەدات .

سوپاس بۆ خودا لەنێو کارخانە هەموو ڕێزیان لیّ دەگرتم، بەسولْتانی کارخانە بانگیان دەکردم، منیش هەرچی لەتوانامدا هەبوو بەبیّ وەستان، کاری تایبەت بەخۆیان و هەندیّ کاری کارخانەشم ڕادەپەڕاند، لەکاتی بوونەوەی دەرگای قوتابخانە، نەژاد ناوی منی خستە نێو قوتابخانەیەك کە زۆر دوورنەبوو لەکارخانەکە، بەڕاستی ئەوسالْی یەکەم جاربوو لەنێو قوتابخانە هەست بەو جۆرە خۆشیە بکەم، بەیانیان نەژاد منی لەبەر دەرگای قوتابخانە دادەبەزاند، نیوەڕۆکەی دەچوومە نێوکارخانە، لەدوای نان خواردنی نانی نیوەڕۆ دەست بەجیّ کاری ڕۆژانەی نێو کارخانەم ئەنجام دەدا، ئێوارانیش کە لەگەڵ نەژاد دەگەڕاینەوە مالْەوە دوای نان خواردن هەندێك یاریم لەگەڵ (موستەفا) ی کوڕی عاتیفە و نەژاد دەکرد، (موستەفا) زۆر خولیای من ببوو، دواتریش دەچوومەوە ژوورە تایبەتەکەی خۆم، هەندێك خوێندنی ڕۆژانەی قوتابخانەم ئەنجام دەداو پاشان دەخەوتم، سوپاس بۆ خودا ژیانم زۆر بەئارامی و ئاسوودەیی تێپەڕ دەکرد .

دوای سێ ساڵ، ئەرکی کارخانەم زیاتر کەوتە سەرشانی، ئیتر نەمتوانی سێ ی ناوەندی تەواوبکەم، تەنانەت وای لێ هات هەندێ جار لەبەر زۆری کاری نێو کارخانە شەوانیش لەوێ بمێنمەوە، ئەو شەوانەی لەماڵەوە دەبووم لەژوورەکەی خۆم دەستم لەقەڵەم و نووسین هەڵنەدەگرت، بەیادی باوکم و ئاغا مورتەزا شیعرو پەخشانم دەنووسیەوە، وە شیعری سەعدی شیرازیم لەبەر دەکرد، ئەگەرچی لەقوتابخانە دابڕام، بەڵام دەست بەرداری خوێندن و نووسینەوە نەبووم، هەر لەوماوەیە پوورە مەعسومە کۆچی دوایی کرد، بەر لەمردنی وەسیەتی کردبوو لەنزیك باوکم بەخاکی بسپێرن، بۆیە من تەنها بۆ ناشتنەکەی ئامادە بووم، چوونکە حەزم نەدەکرد ڕوخساری مامە دڵ ڕەقەکانم ببینم، تەنها لەبەر مامم ئەکرەم و ماڵەوەی پوورە مەعسومە چووم، بەڕاستی پوورە مەعسوومە ئارامیەکی زۆری بەباوکم و من و حەنانەی بەخشیبوو.

کاتێك تەمەنم گەیشتە بیست ساڵ ئاغا ستار لەنێو کارخانە بانگی کردم و ووتی : سوڵتان گیان من داواکراوم ببمە بەڕێوەبەری کۆمپانیایەك، من لێرە ناتوانم درێژە بەکارەکەی خۆم بدەم بۆیە دەبێ تۆ لەجێگای من ببی بەسەر پەرشتکاری کارخانەکەمان، دوێنێ قسەم لەگەڵ (موکەڕڕەم محمودی) بەڕێوەبەری خۆمان کرد ئەویش زۆر دڵی پێ خۆش بوو کە تۆببی بەسەر پەرشتکار، بەڕاستی ئەو زۆر لەتۆ ڕازیە، دواتر نەژاد هاتوو پیرۆزبایی لێ کردم، لەگەڵ ئاغا ستار کەمێك لەمن دوورکەوتنەوە هەندێ قسەی نهێنیان لەنێوان یەکتر دەکرد و جارجار بەزەردەخەنەوە سەیریان دەکردم نەمدەزانی باسی چی دەکەن، نەژاد بەپێکەنینەوە هاتەوە لای خۆم ووتی : بەڕێز جەنابی سوڵتان تۆ

ئەم شەو لەگەڵ ئاغا ستار لێرە بمێنەوە. هەرکارێکت پێویست بوو فەرمانی پێ بکە تۆ ئێستا سەپەرشتکاری ئەوی.

ئەوشەوی لەژووری سەرپەرشتکاران پاڵ کەوتبووم، ئاغا ستار بەئارامی هاتە ژوورەوە لەتەنیشتم دانیشت و هەندێ ڕێنمایی کردم کەچۆن شەوانە سەرپەرشتی نێوکارخانە بکەم، دواتر ووتی : سوڵتان گیان سوپاس بۆخودا تۆ ئێستا پێ گەیشتووی بووی بەگەنجێکی کامڵ، هەروەها چەندین ساڵە لەم کارخانە کارت کردووە ڕێزو گەورەیی خۆت سەلماندووەو جێگای ڕەزامەندی هەمووانی، هەر لەوچەند ساڵانەش (نەژاد) پارەیەکی زۆری بۆ تۆ پاشەکەوت کردووە، ئەوەش لەپاداشتی کاری خۆتە کە لەنێو ئەم کارخانەیە ئەنجامت داوە، دەمەوێ بێمە سەرباسەکە، ئەویش ئەوەیە من ئامۆزایەکم هەیەو کچێکی خواناس و دیندارە دەمەوێ هەرئێستا بچین بۆماڵەوەیان، بۆخۆتان لەگەڵ یەکتر قسە بکەن، ئەگەر ئێوە بەیەکتر ڕازی بوون، ئێمەش دوای چەند شەوێکی تر بەناوی خودا کاری مارەبڕین و هاوسەرگیریتان بۆ دەسازێنین! کچەکەش ناوی (خەزان)ە و تەمەنی ١٩ ساڵە، دڵنیابە بەدڵی تۆ دەبێت، با ناوی خودا لێ بێنین و بڕۆین بۆ ئەم میوانداریە! لەدوای ئەم قسانەی ئاغا ستار تەزوویەك هەموو گیانمی گرتەوە! لەشەرما سەرم دانواند بەنەرمیەوە ووتم: بەخوا من زۆر شەرم دەکەم! ناتوانم لەگەڵت بێم بۆ ئەم میوانداریە، لەوانەیە بێمە بەردەرگای ماڵیان لەترس و شەرما گیانم دەربچێ، ئاغا ستار بەزەردەخەنەوە ووتی: وانی یە سوڵتان گیان هەر کە گەیشتیە بەردەرگای ماڵی خەزان هەرچی ترسە نامێنێ، کە دەرگاشیان کردەوە هەرچی شەرمە نامێنێ، هەردووکمان بەدەنگی گەورە

لەقاقای پێکەنینمان دا و پاشان ووتم: ئاخر چۆن بەبێ عاتیفەی خوشکم و نەژاد ئەم بڕیارە بدەم ؟

ئاغا ستار ووتی : بێ قەزابێ ئەم ڕێ و ڕەسمەی ئەم شەو چۆن بێ ئەوان بەڕێوە دەچێ ؟

ووتم کەواتە گفتۆگۆو نهێنیەکەی تۆو نەژاد هەر ئەوەبوو ، ئەوشەوی لەگەڵ ئاغاستار چووینە ماڵی خەزان، بەڕاستی زۆر بەڕێزەوە پێشوازیان لێ کردین، گوێم لێ بوو ئافرەتەکان لەنێو خۆیان دەیان ووت : ڕەنگ و ڕوخساری لە عاتیفەخانی خوشکی نزیکە، پێدەچوو ئەو ڕۆژەی عاتیفەش بۆ بینینی خەزان هاتبوو، ئەو کاتەی خەزان لەبەرامبەرم دانیشت و بەڕێزەوە سڵاوو ئەحواڵپرسینی کردم، کاتێك کەوتە ووتو ووێژو پرسیارکردن، هەستم کرد کچێکی ڕەوشت بەرزو زیرەك و هۆشمەندە، لەکۆتایی دانیشتنەکە هەردووکمان ڕەزامەندیمان بەرامبەر بەیەکتر نیشان دا، ئەو شەوەی لەکاتی گەڕانەوەمان بۆکارخانە لەڕێگا ئاغا ستار لەنێو ئۆتۆمبێلەکە بەزەردەخەنەوە ووتی : کوڕی بێ شەرم خۆ لەم دانیشتنەت لەگەڵ خەزان پیتێکت بەهەڵە دەرنەبڕی، هەردووکمان لەقاقای پێکەنینمان دا، من چوومەوە نێو کارخانە ئاغا ستاریش بەرەو ماڵەوە ڕۆیشت و بەزەردەخەنەوە ووتی: پیرۆزە زاوای نوێمان!

ئەوشەوی لەکارخانە لەژوورەکەی خۆم هەستم بەخۆشیەکی یەکجار خۆش کرد، دواتر هاتمە حەوشی کارخانەو سەیری ئەستێرەکانم دەکرد، لەوکاتە باوکم هاتەوە یادی کە دەی ووت: دوعام زۆر بۆکردی کە خودا ژیانێکی خۆشت پێ ببەخشێ، لەقوڵپەی گریانم داو ووتم: باوکە گیان خۆزگە ئەم شەو تۆ زیندوو بوای، ئەم میوانداریەت بەچاوی خۆت بینیبوایە !! ئای تۆ لەژیانت چەند

بەئومێدی ئەم شەوە بووی، پاشان هاتمەوە ژوورەوە توانیم کەمێك بخەوم، دوای دوو ڕۆژ بە ئامادەبوونی مام ئەکرەم و خانەوادەی پوورە مەعسومە و عاتیفە و نەژاد و ئاغا ستارو خانەوادەکەی و ماڵەوەی خەزان ڕێ و ڕەسمی مارەبڕین بەڕێوە چوو هەموو ئامادەبووان بەزەردەخەنەوە پیرۆزباییان لەمن و خەزان کرد، بەر لەڕۆیشتنمان خەزان ووتی : سوڵتان ئەگەر بکرێ بەر لەوەی ژیانی هاوسەرگیری پێك بێنین، هەردووکمان بەیەکەوە سەردانی گۆڕستان بکەین بۆلای دایکم! چوونکە وەسیەتی خۆیەتی.

منیش زۆر بەڕێزەوە داوایەکەم قبوڵ کردو ڕۆژەکەمان دیاری کرد،

ئەو ڕۆژەی کەبەیەکەوە چووینە سەردانی گۆڕی دایکی، لەو سەردانە من و خەزان باسی خانەوادەی خۆمان کرد بۆ یەکتر ، ئێوارەکەی بەرلەوەی هەریەکەو بۆماڵەوەی خۆمان بڕۆینەوە، خەزان ووتی: بەر لەماڵئاوایی کردن داوایەکی ترم هەیە!

منیش بەڕێزەوە ووتم: چ داوایەکە بفەرموو ووتی : دەمەوێ لە ئەمڕۆوە تا ڕۆژی مردنمان پەیمان بەیەکتر بدەین بەردەوام هەموو شتێك لەنێوانمان لەسەر بنچینەی پرس و ڕاو ڕاوێژکردن بێت، بۆ ئەوەی ژیانێکی پڕ لەخۆشی و تەبایی بەدەست بێنین !.

منیش ووتم : بەڕاستی ئەوەی لەدڵی من دا هەبوو سوپاس بۆخودا خۆت دەرتبڕی، من بەشانازیەوە پەیمانت پێدەدەم و داوایەکەت داوای منە، کەواتە هەردووکمان پەرۆشی ئەم جۆرە ژیانەین، هەرلەو ڕۆژەوە من و خەزان پەیمانمان بەیەکتردا، تا ئێستاش لەسەر پەیمانەکەمان بەردەوامین، هەفتەی دواتر ژیانی هاوسەرگیریمان پێك هێنا، من و خەزان لەنێو ماڵی عاتیفە و نەژاد

لەهەمان ژووره تایبەتەکەی خۆم دەژیاین، ساڵی دواتر من و خەزان بووین بەخاوەن کوڕێك ناومان نا (کەمال) بۆئەوەی ناوی باوکم لەگوێچکەم بمێنێ، وەك چۆن لەدڵم ڕەگی داکوتیوە، وەك دوو خانەوادەی خنجیلانە لەنێو یەك ماڵ بەوپەڕی خۆشەویستی و تەبایی یەوە دەژیاین، دوای دووساڵ من و خەزان توانیمان لەنزیك ماڵەوەی عاتیفە و نەژاد خانوویەکی خنجیلانە بکڕین، ئەویش بەهۆی بەشێك لەپاشەکەوتی خۆم و هەندێك بەشەمیراتی خەزان کە لەدایکیەوە بۆی مابۆوە، هەروەها ئاغا ستار و موکەڕەم محمودی و عاتیفەی خوشکم یارمەتیان داین، ئەوکاتەی تەمەنم گەیشتە بیست و پێنج ساڵ، بووین بەخاوەن سێ منداڵ کەمال و هاشم و ڕوقیە، هەر لەوماوەیە بوو فەزڵی مامم کۆچی دوایی کرد، ئەگەر لەسەر داوای حیسام و حەنانە نەبوایە من و عاتیفە بەشداری پرسەکەمان نەدەکرد، لەبەرئەوەی حەنانەی لەئێمە فرۆشتبوو، ئەو ڕۆژە حیسام و حەنانە هاتنە ماڵەوەمان، حیسام ڕووی لەمن و عاتیفەی خوشکم کردو ووتی: دەزانم ئێوە لە مامتان تووڕەن، مافی خۆتانە، ئێمەش دەزانین مامتان تەنها لەبەر بەرژەوەندی خۆی حەنانەی بەئێمەدا، مامتان بۆیە ئەوکارەی کرد بۆئەوەی باوکم لەکۆمپانیا جێگایەکی باشی پێبداو مووچەی بۆ زیاد بکات، بەڵام سوپاس بۆ خودا بەهاتنی حەنانە بۆماڵەوەمان، گۆڕانکاریەکی زۆرباش لەوچەند ساڵە بەسەر خانەوادەکەمان هات، بەڕاستی ئەوخوشکەتان توانی کاریگەری هەبێ لەسەر دایکم و هەرسێ خوشکەکانم، ئێستاش دایکم دەڵێ : حەنانە لای من لەکیژەکانم خۆشەویستترە، لەبەرئەوەی ئافرەتێکی چاوچنۆك و چاوبرسی نیە، ئەو مەینەتی هەژاری بینیوە، بۆیە ئەو لەئێمە زیاتر ڕێز لەنیعمەتەکانی خودا دەگرێ. هەروەها منیش هەرچەندە دۆستی دیندارم زۆرن،

بەڵام هیچیان بە ئەندازەی حەنانەی خوشکتان کاریگەری لەسەر من نەبوو، ئەوە حەنانە خۆی لێرە ئامادەیە، کە دایکم و باوکم و سێ خوشکەکەم چ ڕێزێکیان لەئەو گرتووە و هیچ سووکایەتیان پێ نەکردووە، سەبارەت بەسێ برایەکانم ئەوان کەسانی لەخۆبایی و دونیا پەرستن، تەنانەت بەرامبەر بەمنیش لوتیان بەرزە، ئێستا هەست دەکەم بەرامبەر دایك و باوکیشم هەڵس و کەوتیان گۆڕاوە، دایکم ئێستاش دەڵێ : حەنانەخان! هەزار ڕەحمەت لەباوکت لەگەڵ ئەو نەبوونی و هەژاریەی توانی ئێوە بەم شێوەیە پەروەردەبکات، کەچی ئێمەش لەگەڵ ئەم هەموو سەروەت و سامانە زۆرە، تەنها توانیمان منداڵەکانمان فێری لووت بەرزی و چاوچنۆکی بکەین، حیسام لەقسەکانی بەردەوام بوو، دواتر ووتی دڵنیابن هاوسەرگیری من و حەنانە جێگەی فەخروشانازیە بۆ هەموو لایەکمان، بۆیە نامەوێ غەم لەم مەسەلەیە بخۆن، ئێستاش من خۆم بەقەرزاری فەزڵی مامتان دەزانم، بۆیە تکاتان لێ دەکەم با هەرچوارمان بەیەکەوە بچین بۆ ناشتن و پرسەکەی.

عاتیفە ڕووی لەحیسام و حەنانە کردو ووتی: هەرچەندە من و سوڵتان حەزناکەین بۆ ئەم پرسەیە بێین، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو بەهۆکاری خۆشبەختی ژیانتان دەزانن بۆیە لەگەڵتان دێین .

کاتێك چووین بۆماڵەوەیان تەرمەکە ئامادەکرابوو بەرەو گۆڕستان ڕۆیشتین، دوای ناشتنی تەرمی مامم، ئەو ڕۆژە تا ئێوارە لەپرسەکە بەشداریمان کرد، مامەکانم و کوڕی مامەکانم زۆر ڕێزیان لێ گرتین بەتایبەتی مام ئەکرەم ووتی : سوڵتان بەڕاستی ئێوە میهرەبان و گەورەیی خۆتان سەلماند، ئەگەر باوکیشت مابوایە دڵنیام وەك ئێوە لێرە ئامادە دەبوو .

ئێوارەکــەی بــەر لەڕۆیــشتنمان حیــسام نامەیــەکی دەرهێنــاو دای بەدەســتی مامــەکانم، ووتــی پێداویــستی پرســەکەی پــێ جــێ بــەجێ بکــەن، پێدەچــوو مەبلەغێك پارەی وەك هاوکاری دانابێ بۆ کاروباری پرسەکەی مام فـەزڵ، پاشـان ماڵئاواییمــان لێکــردن و ئــەوانیش زۆر بــەڕێزەوە بــەڕێیان کــردین، لــەکاتی گەڕانەوەمان هەرچوارمان لەنێو ئۆتۆمبێـل بـەبێ دەنگی دانیـشتبووین. حیـسام بەقسە هات و ووتی : سوڵتان ئێستا هەستت چۆنە؟، منـیش لـەنێو ئـەم جـۆرە خەیاڵانە بووم، کە بەڕاستی ڕۆژگـار زۆر بـەخێرایی تێپـەڕ دەبێـت هـیچ شتێك وەك خـۆی نـامێنێ، ئـەوەی لـەڕابردوو ڕقـت لێ ی بـوو لـەداهاتوو بـەزەییت پـێ دێتەوە، ئەوەی ئەمڕۆ بەلاتەوە جوانە سبەینێ لەبەرچاوت ڕوخسارێکی ناشرین هەڵدەگرێ، ئەوەی ئێـستا غـەمی پـێ دەخـۆی، بـەیانی دڵـت پـێ ی خـۆش دەبـێ، ئــەوەی ئــەم ســاتە بەلاتــەوە خراپــە لــەکاتێکی تــر بەلاتــەوە باشــترین شتـە،نهێنیەکانی ژیـان هـەروەك تـاریکی ژێـر دەریایەکانـە، مرۆڤـ نـاتوانی وەها بەئاسانی بەسەر ئەو هەموو نهێنیانە زاڵ بێت و بیانزانێت.

کاتێـك تەمـەنم گەیـشتە ٢٩ سـاڵ، شـەوێکیان لـەنێو خانەوادەکـەم دانیـشتبووم وەك جارانی پێشوو باسی ئاغا مورتەزاو زیباخانی دراوسێیە دڵسۆزەکەی خۆمان دەکرد،

خەزان ووتی : باشە تۆ ئەوەندە باسیان دەکـەی ئێـستا هـیچ هـەواڵێکت هەیـە لەبارەی ئەوان ؟

منیش ووتم : دەزانم ماون و لەجێگای خۆیانن، بەڵام هیچ زانیاریەکم لەبارەی ووردەکاری ژیانیانەوە نی یە، تەنها بیستوومە کەماون .

خەزان ووتی : سوڵتان چۆن دەتوانی دەستبەرداری ئەو جۆرە خواناسانەبی، ئەوان بۆ ئێوە بەوجۆرە دڵسۆزبوونە کەچی تائێستا تۆ سەردانت نەکردوونە، بەیانی بڕۆ سەردانیان بکەو خۆتیان پێ بناسێنەوە . دواتریش بەیەکەوە سەردانیان دەکەین، منیش حەزدەکەم لەنزیکەوە بیانناسم !

منیش بۆبەیانی دوای ئەوەی ڕوخسەتم لەکارخانە خواست و بەرەو گەڕەکە کۆنەکەمان بەڕێ کەوتم، بڕیارمدا سەرەتا بڕۆمە مزگەوتەکە لەوێ نوێژی نیوەڕۆ بکەم، دەمزانی ئاغا مورتەزا نوێژەکانی هەموو لەمزگەوت بەجێ دەگەینێ، دوای هەژدە ساڵ ئەوە بۆ یەکەم جاربوو بەنێو گەڕەکەکەمان تێپەڕ ببم، بەڕاستی هەستێکی زۆر سەیرم لەلا دروست بوو، گەیشتمە ڕاست دەرگای خانووەکەمان، ئەو خانووەی کە ساڵانێك بوو ژیانمان تێیدا بەسەر دەبرد، بینیە لەگەڵ خانووەکەی تەنیشتی کراوەتە یەك خانووی گەورە، لەکۆڵانەکەمان دڵە پڕبوو لەغەم، لەبەرئەوەی لەنێو ئەو کۆڵانە بەغەمەوە ژیانی منداڵیە بەسەربرد، غەمی نەخۆشی باوکم و غەمی هەژاری و غەمی بێزاری دایکم کاتێك چوومە بەر دەرگای مزگەوت، بەترسەوە لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزیم ( چوومە نێو حەوشی مزگەوت و بینیم دیمەنی مزگەوتەکەش گۆڕانکاری بەسەرهاتوە، لەکاتی نوێژکردن سەیرم کرد تەنانەت ئیمامی مزگەوتەکەش گۆڕابوو، جاران مامۆستا (حەسەن کرمانی) ئیمام بوو، ئای پیاوێکی چەند سادەو خاکی و قسە خۆش بوو، لەدوای تەواوبوونی نوێژ چاوم گێڕا پیاوێکم بەتەمەنم بینی، لەچاوو برۆیەکانی خوێندمەوە کە ئەمە ئاغا مورتەزایە، بەڵا بۆ دڵنیابوونم لەهەیوانی مزگەوتەکە لەکەسێکم پرسی و ووتم : ئەگەر پێما بفەرمووی ئەوپیاوە بەڕێزە ناوی چی یە ؟

ئەویش ووتی : ناوی حاجی مورتەزایە .

بەڕاستی لەگەڵ گوێ بیست بوونی ئەم ناوە گریانم بۆهات بەڵام توانیم خۆم ڕاگرم، بەڕاستی وام زانی کەمال ئەسکەندەری باوکم زیندووبۆتەوە.

بەئارامی بەدوای حاجی مورتەزا ڕۆیشتم، لەحەوشی مزگەوت دەستم لەسەر شانی داناو ووتم : حاجی مورتەزا سڵاوی خوات لێ بێت، ئەویش زۆر بەڕێزەوە وەڵامی سڵاوەکەی دامەوە بەزەردەخەنەوە ووتی : تۆ لاوێکی نوێ ی هاتی بۆ مزگەوتەکەمان، یەکەم جارە تۆ ببینم !

منیش ووتم : نە یەکەم جارەو نە دواجاریش دەبێت،

بەڕەنگ و ڕوخسارە جوانەکەیەوە ووتی : من لە وەڵامەکەت تێناگەم، مانای زۆر هەڵدەگرێ .

منیش ووتم : هەژدە ساڵ لەمەوبەر پیاوێکی هەژار دراوسێتان بوو، لەکاتی کرێکاری پەکی کەوت تامردن کەوتە سەرجێگا، ئەویش دەست بەجێ ووتی : بەڵێ کەمال ئەسکەندەری بوو خوا لێ ی خۆش بێت! بەڕاستی دۆستی دێرینم بوو.

ووتم : لەدوای مردنی ئەو، منداڵەکانی چیان بەسەر هات ؟

ووتی : چوونە لای مامەکانیان .

ووتم : کوڕێکی هەبوو بەناوی سوڵتان، ئەگەر ئێستا ببینی دەیناسیەوە ؟

بەووردی سەیری کردم و بەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە زەردەخەنەیەکی هێنا ووتی : قوربانت بم سوڵتان ئەوە تۆی ؟

بەتووندی منی گرت و لەباوەشی خۆی نام و زۆری ماچ کردم، ووتی : بەڕەنگ و ڕوخساری خۆت ڕوخسارە جوانەکەی باوکتم هاتەوە یاد، زۆر بەسەر سوڕماییەوە سەیری ڕوخساری دەکردم،

ووتی : من چەند پرسیارم کرد لەخەڵك لەبارەی تۆ، کەچی هیچ هەواڵێکم دەست نەکەوت، بەڵام سوپاس بۆ خودا خۆت بۆلامان هاتی، ئینجا بەووشەی فەرمووو ووتی : وەرە گەورەمان کەو ماڵەکەمان بڕازێنەوە و زیباخانیش بەدیداری خۆت خۆشحاڵ بکە !

بەیەکەوە چووینەوە ماڵەوەیان، لەکاتی دەرگاکردنەوە سەیری زیباخانم کرد بەتەواوەتی چوو بووە نێو تەمەنەوە، حاجی مورتەزا بەزەردەخەنەوە ووتی : زیباخان ئەو سوڵتانەی ساڵانێکە بەدوای دەگەڕێین ئەوە خۆی هاتوە بۆ میوانداریمان .

زیباخان سەیرێکی کردم و ووتی : کوڕی ئاغای ئەسکەندەری ؟

ووتم : بەڵێ ، بەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە سەری ماچ کردم و زۆر بەڕێزەوە ئەحواڵپرسینی لێ کردم و بە ووشەی بفەرموون تا حەوشی ماڵەوەیان بردم،

لەکاتی دانیشتنم لەنێو باغچەکەیان ئافرەتێك منداڵێکی لەباوەش گرتبوو زۆر بەڕێزەوە بەخێرهاتنی کردم.

حاجی مورتەزا ووتی : ئەوە خێزانی ماجیدی کوڕمە.

بەیادم هاتەوە حاجی مورتەزا کوڕێکی بچووکی هەبوو بەناوی ماجید، سێ تا چوارساڵ لەمن بچووکتر بوو، ووتم : حاجی مورتەزا من ماجیدم بەیاد دێتەوە، بەڵام بڕواناکەم ئەو منی لەیادبێ.

حاجی مورتەزا ووتی : ئێستا ماجید بوویتە (ئەندازیار)، هەموو کچ و کوڕانی تـرم چوونەتە ڕێگـای خۆیـان، تـەنها ماجیـدو خانـەوادە خنجیلانەکـەی ئـەوم لەگەڵ ماوەتەوە .

ئینجا کەوتینـە بـاس و خواسـی ڕابردوومـان، بەتێروتەسـەلی زۆرشـتمان بـاس کرد، دواتر حاجی مورەتەزا سەیرێکی زیباخانی کردو ووتی : بەڕاستی ئێمە بـە ووردی ئاگاداری بارودۆخی خانەوادەکەتان بووین،

منـیش ووتم : بەڕاسـتی ئێمـە بـۆ هـەتا هەتایـە خۆمـان بـە قـەرزاری خانەوادەکەتان دەزانین، چوونکە ئێوە دڵسۆزو خەمخۆری ئێمە بوون.

حاجی مورتەزا ووتی : ئێمە هیچمان بۆئێوە نەکردووە، کاتی خۆی زانیاریمان هەبوو کە دایکتان لێتان جیا دەبێتەوە، هەر بۆیە من داوام لەباوکت کرد غـەمی منداڵەکانت نەبێ، ئەگـەر تـۆش دونیـا جێ بهێڵی، مـن و زیباخـان وەك منـداڵی خۆمـان بـەخێویان دەکـەین، بـەڵام دوای مردنـی باوکـت مامـەکانت بـەم کـارە هەڵسان و ئێمەش نەمانتوانی داوای ئێوە بکەین، بۆیـە ئێمـە هیـچمان بـۆ ئێـوە نەکردووە .

ووتم : حاجی مورتەزا دەزانم ئێوە زانیاریتان هـەبووە لـەبارەی جیابوونـەوەی دایکم هەروەك خۆتان دەڵێن، بەڕاستی زۆر حەزدەکەم لەنزیکەوە ئاگاداربم لـەم مەسەلەیە، ئینجا نازانم جەنابتان ئەم داوایەم جێ بەجێ دەکەن ؟

حاجی مورتەزا بەزەردەخەنـەوە ووتـی : باسـم نـەدەکرد، بـەڵام لەسـەر حـەزو داوای خـۆت ئـەم مەسـەلەیە بـاس دەکـەم، بەڕاسـتی لـەدوای نەخۆشـی باوکـت و کەوتنی لەسـەر جێگـا، دایکتـان هەسـتی بـەئازارێکی دەروونـی دەکـرد، نەخۆشـی

باوکتان لەلایەك و هەژاری خانەوادەکەتان، ساڵانێك ئەو بارودۆخە بۆ دایکتان زۆر سەخت و دژواربوو، بەیانیان کە دایکتان ئێوەی بۆ قوتابخانە بەڕێ دەکرد، دواتر فائیق ی کۆنە دراوسێمان بە ئۆتۆمبێلەکەی بەلای بەردەرگاتان تێپەڕی دەکردو کەمێك لەگەڵ دایکتان دەوەستاو سڵاوی لێ دەکرد بەپاساوی هەواڵ پرسینی باوکتان، دەمێك بەیەکەوە قسەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد، منیش وەك پاسەوانێك پاسەوانیم لەماڵی برای خۆم دەکرد، سوپاس بۆ خودا نە فائیق لە ئۆتۆمبێلەکەی دەهاتە خوارەوەو بچێتە ژوورەوە، وە نە دایکت لەگەڵی دەڕۆیشت و تەنانەت نەدەچووە ماڵەوەشیان، سوپاس بۆخودا هیچ شتێکی ناشەرعی لەنێوانیان ڕوویندەدا، بەڵام بەرلەوەی هەرشتێك ڕووبدات من و زیباخان بڕیارماندا باوکت لەوبارودۆخە ئاگاداربکەینەوە .

منیش سەیرێکی زیباخانم کرد، بینیم بەزەردەخەنەو بەئارامی سەری بەرزو نزم دەکردەوە وەك ئەوەی پاڵپشتی قسەکانی حاجی دەکرد .

حاجی مورتەزا لە قسەکانی بەردەوام بوو ووتی : من و زیباخان پیلانێکمان دانا کە چۆن باوکتان لەم بارودۆخە ئاگاداربکەینەوە بەهەرحاڵ وامان کرد، زیباخان لەهەیوانی ماڵەکەتان دایکتی بەقسەکردن سەرقاڵ کرد، منیش لەژوورەوە لەگەڵ باوکت بەئارامی کەوتمە قسەکردن.

ووتم : ئاغای ئەسکەندەری! خۆت چاك دەزانی ئێمە چەند دڵسۆزین بۆیەکتر، دەبێ بەرژەوەندی یەکتریش بپارێزین، ووتم: هەرشتێك لەبەرژەوەندی ئێوەبێت من دەبێ بیڵێم، بەڵام دەبێ تۆ پەیمانم پێ بدەی ئەوپەڕی بەنەرمی و ئارامیەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم باسە بکەی ،

باوکیشت زۆر بەڕێزەوە ووتی : مورتـەزای بـرام هەرچی تـۆبڵێ ی وادەکـەم و پەیمانەکـە دەبەمەسـەر، ووتم : سـوپاس بۆخـودا سـەرم بەدۆسـتایەتی کردنـت بەرزە، وە هەرکەم و کوڕیەك لەئێوەی بەڕێز بەدی بکرێـت، ئـەوە بەدڵنیاییـەوە ئەو کەم و کوڕیە بەر منیش دەکەوێت و منیش دەگرێتـەوە، دواتـر بەتـەواوەتی باسی وەستانی فائیق و نەسرینی دایکتم بۆ باوکت کرد. ئـەویش قسەکانی منـی پشت ڕاست کردەوە و ووتی : بەڵێ مـن لـەم پەنجەرەیـە چاودێریم کـردوون کـە نەبادا فائیق بێتـە ژوورەوە، لـەوکات و ساتانە لـەخودا پاڕامەتـەوە، خودایـە مـن بڕبڕەی پشتی جەستەم شـکاوە، سوپاسـی تـۆ دەکـەم و ئـارامی لەسـەر ئـەم حاڵـە دەگـرم، بـەڵام خودایـە داوات لێ دەکـەم بڕبـڕەی پـشتی ڕۆح و شـەڕەفم بپـارێزە، چوونکە بەرگەی ئەو جۆرە پشت شکانە ناگرم ! بینـیم باوکـت دەسـتی بـەڕووی خـۆی وەنـا، لەقوڵپـەی گریـانی دا دواتـر ووتـی : ئـەو ئافرەتانـەی کەلـەنێو کۆمەڵگەی ئێمە دەیانەوێ بـەرەو خراپـە هـەنگاو بنـێن، ئەگـەر دەزانـن کـەس و کاریان تووشی چ ئازارێکی دڵ و ڕۆح دەبن، هەرگیز بیریش لەخراپە ناکەنەوە.

منـیش ئـارامم کـردەوە ووتم : هاتوومـە ڕێگـا چـارەیەك بۆئـەم بارودۆخـە بدۆزینەوە، جاران ووتوویانە کراسەکەت هەتا کونێکی بـچووکی هەیـە بـەزوویی بیـدورەوە، ئـەگینا، کـە شـوێنەکەی دڕاو گـەورەتربوو، ئـەوکات بەپینـەکردنیش هەر عەیبدار دەبێ .

باوکت ووتی : مـن ماوەیـەك بـەر لەئێـستا خـەونێکی ناخۆشـم بینـی، هەسـتم کرد ئەوخەونە ئاگادارکردنەوەیە بـۆمن، مانـای وا دەگەیانـد کـە نەسـرین لـەمن جیادەبێتـەوە، ئێـستاش لەوەتـەی فـائیق لەبـەر دەرگـا قـسەی لەگـەڵ دەکـات، لەوکاتەوە نەسرین بەشێوەیەك من و ئەو منداڵانە بێزاردەکات، کە ناچارم بکات

دەستی لێ هەڵگرم و تەڵاقی بدەم، من دەزانم خانەوادەی نەسرین زۆر بەڕێزن قبوڵ ناکەن نەسرین دەست لەمن هەڵ گرێ، نەسرین بۆیە وادەکات، بۆئەوەی من دەستی لێ هەڵگرم، بەڕاستی من بۆ ئەم مەسەلەیە چاوەڕوانی مەعسومەی خوشکم دەکرد، کەلەو ڕۆژانە بێتەماڵەوەمان، سەبارەت بەم مەسەلەیە قسەی لەگەڵ بکەم و بەئاگاداری ئەو تەڵاقی بدەم، بەڵام سوپاس بۆ خودا تۆ زووتر هاتی و لەگەڵ تۆ ئەم مەسەلەیە یەك لادەکەمەوە، بەراوێژکردن لەگەڵ تۆ لەهیچ شتێك پەشیمان نابمەوە و باهەر ئێستا ئەم مەسەلەیە یەك لابکەینەوە و بەرلەوەی هەموو گەڕەکەکەمان بەم مەسەلەیە بزانن، دواتر دوا بڕیاری خۆیداو ووتی: ئاغا مورتەزا ئەگەر بەچاکی دەزانی ئەمە دواقسەی منە بۆ نەسرین خان بەئارامی پێ ی دەڵێم : نەسرین خان ! من تازە تامردن ئەمە حاڵمە، بۆیە لەلایەن خۆمەوە ئەومافەت پێدەدەم کە لەژیانی خۆت سەربەستی ئەگەر ناتوانی بەم حاڵە لەگەڵ ئێمە بژیت، ئەوە بۆخۆت ژیان نوێ بکەوە، بەڕاستی منیش حەزناکەم بەهۆی بێزاربوونت لەم ژیانە من و منداڵەکان بێزاربکەی، ناکرێ هەموو ڕۆژ سووکایەتیم پێ بکەی، بەتایبەتی ئەو منداڵە بێ گوناهانە کەتاوانێکیان نی یە بەم شێوە سووکایەتیان پێدەکەی، ئیتر نامەوێ ئەومنداڵانە لەنێو سووکایەتی و جوێن پێدان گەشە بکەن و گەورە ببن، بەڕاستی بۆ منداڵ سەبەرزیە بەهەژاری گەشەبکات، چوونکە فێری مانای ژیان دەبێت، بەڵام بەسووکایەتی پێ کردنی، زۆر سەختە ئاوا بەئاسانی ڕاستە ڕێ ببی، کە گەورەبوو خۆی بەسووك و بێ نرخ دەبینێ، هەروەها کەسانی دەوروبەریش بەسووك سەیردەکات، سەبارەت بەئەرکی بەخێوکردنی ئەوان، ئەوە لە ئەستۆی منن، هیچ غەمی ئەوانت نەبێ، بەدڵنیاییەوە گرینگیان پێدەدەم و دواڕۆژ ببنا

جێ ی ڕەزامەندی خوداو خەڵکانی دەوروبەریان، نەسرین خان ئەمە پووختەی قسەی من و بۆ چوونەکەمە، تۆش لەبڕیاردان بۆ دواڕۆژی خۆت سەربەستی.

حاجی مورتەزا ووتی : من لەگەڵ بیستنی ئەم قسانە زۆرخۆشحاڵ بووم و باوکتم ماچ کردو ووتم: ئاغای ئەسکەندەری بەڕاستی سەلماندت کە لەمن هۆشمەندترو زیرەکتری، بەدڵنیاییەوە من و زیباخان خزمەتی تۆو ئەو دوومنداڵەش دەکەین، هەرچی لەتوانای ئێمە دابێت بۆتانی جێ بەجێ دەکەین،

هەرهەمان شەو باوکت ئەم قسانەی لەگەڵ دایکت کرد، دایکیشت بۆبەیانیەکەی هەواڵی بۆدایکی و خاڵت ناردبوو، کە خۆیان لەنزیکەوە لەزاری باوکت ئەم قسانە ببیستن.

منیش ووتم : حاجی مورتەزا خۆم ئاگاداری دانیشتنی داپیرەم و خاڵم و باوکم بووم.

حاجی مورتەزا ووتی : سوپاس بۆخودا جیابوونەوەکەی دایکتان بەئارامی و بەبێ قسەو زوبانی خەڵك بەڕێوەچوو،

منیش ووتم بەڕاستی ئێوە دوای ڕۆیشتنی دایکمان بۆئێمە خەمخۆربوون و لەهەموو ڕوویێکەوە یارمەتیتان داین و ئارامیتان بەئێمە بەخشی، بەقسەی خۆشەوە ئێستاش لەیادمە ئێواران بەووتە خۆشەکانت و شیعرە پڕ لەمانایەکانی حافزی شیرازی ماڵی ئێمەت دەڕازاندەوە، غەم و پەژارەکانی ماڵی ئێمەت ڕاماڵیبوو،

حاجی بەزەردەخەنەوە سەیرێکی کردم و چەند پارچە شیعرێکی خوێندەوە ووتی :

حلالـــــم کـــــن اگـــــر دوری اگـــــر دورم
اگـــر بەگریـــە مـــی خنـــدم حـــلالم کـــن کـــە مجبـــورم
نگوعـــادت کـــنی بـــی تـــوکـــەمی دونـــی نمـــی تـــونم
کـــەمی دونـــی نفـــس هـــامو بەدیـــدار تـــو مدیـــونم

واتە :

لێـــــم ببـــــورە ئـەگـــــەر دووری ئـەگـــــەر دوورم
گـــەر لەگـــەڵ گریـــان پـــێ کـــەنیم لـــێم ببـــورە کەناچـــارم
مـەڵـــێ ڕاهـــاتووم بـــەبێ تـــۆ کـــەدەزانی مـــن نـــاتوانم
کە دەزانی هەنـاسـەکانـم بەدیداری تـۆ قەرزارم

منیش ئەم پارچە شیعرەی خۆم بۆ ووت کەپێشتر لەبارەی خانەوادەکەمان نوسیبووم .

اگـــــر دنیـــــای ماسنـــــگ اســـــت
بـــدان ســـنگینی ســـنگ هـــم قـــشنگ اســـت
اگـــر عاشـــق شـــدن پـــس یـــک گنـــاه اســـت
دل عاشـــق شکـــستن صـــد گنـــاه اســـت

واتە :

ئەگـــەر بۆئێمـــە ســـەخت و قورســـە ئـــەم ژیانـــە

بـــــزانە قورســـــایی بـــــەردیش هـــــەر جوانـــــە

ئەگـــەر دڵـــدار بـــوون تـــەنها یـــەك گوناهـــە

ڕەنجـــانی دڵـــی دڵـــدارو دۆســـتان ســـەد گوناهـــە

حاجی مورتەزا لەگەڵ بیستنی ئەم پارچە شیعرەم زۆر خۆشحاڵ بـوو، دەسـت خۆشـی لێ کـردم و ووتـی: ئـەم پارچـە شـیعرە لەسـەر دەفتـەری یادەوەریـەکانم دەنووسمەوە و لەژێرەوەی شیعرەکەش دەنووسم : سوڵتان ئەسکەندەری .

دواتر ووتی : سوڵتان گیان، بزانە چ باوکێکی ڕەسەن و چاکت هەبوو، سەیرکە دوای مردنی خۆشی، بێ دۆستی نەکردم و تۆی کردەوە دۆستم، بەڕاستی باوکت دۆسـتی قیامـەتی بـوو، نـەك دۆسـتی دونیـایی، ئـای سـوڵتان ! زۆرجـاران لەبـەر خۆمەوە دەڵێم : خودایە ئێمە ئەم مافەمان نی یە قسە لەبارەی فەرمانەکانی تۆ بکەین، بەڵام نازانم بۆچی دۆستانی خوایی و ڕاسـتەقینە زوو ماڵئـاوایی لـەدونیا دەکەن، کەچی دۆستی درۆیینەو ڕوخساری دونیا پەرستان، ڕۆژ بـەڕۆژ زۆردەبـن و لـووت بـەرزی خۆیـان بەئێمـە نیـشان دەدەن، زۆر سـەیرە نـە ئـەوان لەئێمـە تێدەگەن و نەئێمەش لە ئەوان تێدەگەین.

بەڕاسـتی ئـەو ڕۆژی لـەماڵی حـاجی مورتـەزا جـۆرە ڕۆحیـەتێکی تـرم هاتـە جەسـتەو دڵ و دەروونم، ئـەو ڕۆژی زۆریـان هەوڵـدا تـا ئێـوارە بمێنمـەوە بـەڵکو ماجید ببینم.

ووتم : لەبەر ئەركی كارخانە دەبێ بەجێتان بهێڵم،بەڵام پەیمانتان پێ دەدەم لەگەڵ خانەوادەكەم بەردەوام سەردانتان دەكەم، دەبێ ئەم دۆستایەتیە نوێ بكەینەوە كە ساڵانێكە كپ و مات بووە !

حاجی مورتەزاو زیباخان ووتیان : ئێمە توانای گەڕانمان نەماوە، دەبێ تۆ وەك كوڕێكی خۆمان سەردانمان بكەی. بەر لەماڵئاوایی كردنم زیباخان ووتی : ئەو ڕۆژەی دایكت لەگەڵ خاڵت ئێوەی بەجێهێشت، لەدەرگای ماڵی ئێمەیان دا، بەمەبەستی ماڵئاوایی كردن، منیش بەدایكتم ووت : ئەگەر لەسەر ئەم جیاببونەوەیە پەشیمان بوویەوە، ووریابە بەرگەی ئازارەكانی دڵ و گیانت بگرە، چوونكە ئەوكات ئارام گرتن نەبێ هیچ شتێكی تر سوودی بۆت نابێ .

حاجی مورتەزا لەحەوشەكەیان بەدەم ڕۆیشتنەوە دەستی لەسەر شانی دانام و ووتی : سوڵتان دەمەوێ بزانم دایكت زیندووە یان نا ؟

ووتم : هەست دەكەم زیندووە، بەڵام سەبارەت بەئێمە مردووە و كارمان پێ ی نی یە .

حاجی ووتی : ئێمەش هیچ كارێكمان بەئەو نی یە، بەڵام ئامۆژگاریت دەكەم ئەگەر لەناكاو ڕووبەڕووت بۆوە توخوا سووكایەتی پێ نەكەی! تكات لێ دەكەم سەنگایی خۆت ڕاگرەو ڕێزی ئەویش بگرە، چوونكە باوكت هەتا مردنیش بەڕێزەوە باسی دایكت و خانەوادەكەی دەكرد و بە ووشەی (نەسرین خان) ناوی دەهێنا، دەمەوێ لەمەشیان وەك باوكت بی،

منیش ووتم : هەرچەندە نامەوێ بەهیچ شێوەیەك بیبینم، بەڵام ئەگەر لەناكاو بینیم ، بەدڵنیاییەوە ئامۆژگاری و فەرمانەكەت جێ بەجێ دەكەم !

ئینجا ماڵئاواییم لێ کردن و زۆر بەڕێزەوە بەڕێیان کردم.

پاشان سەردانمان بۆماڵی ئەوان بەردەوام بوو، لەوسەردانە بەردەوامانـە، مـن و ماجید بەیەکتر ئاشناو شاد بووینەوە، زۆر خۆشحاڵ بوو بەدۆستایەتی من .

تەمـەنم گەیـشتە (٣١) سـاڵ ڕۆژێکیـان حەنانـە تەلـەفۆنی کـرد ووتـی : دایکـی حیـسام مـردووە. عاتیفـە نـەیتوانی بەشـداری پرسـەکە بکـات ئـەویش بـەهۆی ئەوەی تازە لەنخۆشخانە دەرچووبوو دوا منداڵی هاتە دونیا، منیش تـەنها لەبـەر خاتری حیسام و حەنانە بەشداری پرسەکەم کرد لەمزگەوت، کاتێـك لەپرسـەکە چاوم بە قاسم ی برا گەورەی حیسام کەوت زۆر نارەحەت بووم، نزیکـەی بیـست ساڵ لەمەوبەر لێدان و سووکایەتی ئەوم هاتە بەرچاو، بینـیم هـەمان ڕوخـسارە لـووت بـەرزو تووڕەییەکـەی مـاوە، بۆیـە نـەمتوانی پرسـەو سەرەخۆشـی لەئـەو بکەم، تەنها لەگەڵ باوکی حیسام و برایەکانی تری پرسەو سەرەخۆشیم کرد .

بـاوکی حیـسام ووتـی : ڕەحمـەت لـەگۆڕی ئـەو باوکـەتان کەچـۆن پـەروەردەی کردوون، سوڵتان دەبێ نیوەڕۆ لەگەڵ خۆمان بۆماڵەوەمان بێی !

منیش ووتم : زۆر سوپاستان دەکەم دەبێ بڕۆم لەبەر ئەوەی ئەرکی کارخانـەم لەسەرشانە، ئەویش لەگەڵ حیسام و دووکوڕەکـەی تـری زۆر بـەڕێزەوە بـەڕێیان کردم.

دووهەفتە دوای پرسەکە حیسام لەگەڵ حەنانە هاتنە سەردانمان .

حیسام ووتی : سوڵتان باوکم حەزدەکات سەردانێکی ماڵەوەمان بکەی، دەیـەوێ لەنزیکەوە بتبینێ و قسەت لەگەڵ بکا !

منیش بەداوای لێبوردنەوە داوام لەحیسام کرد کەناتوانم بێمەماڵەوەتان، ووتم: من حەزناکەم بەبینینی کۆشکەکەتان ڕۆژگارێکی تاڵم بێتەوە یاد،

حیسام بەزەردەخەنەوە ووتی : ئەگەر حەز دەکەی ئەوا نەژاد لەگەڵ خۆت بهێنە .

نەژاد بەپێکەنینەوە ووتی : حیسام بەخوا من ناوێرم بێمە بەردەرگای ماڵەوەتان، بەڕاستی من بەرگەی لێدان ناگرم، سوڵتان کاتی خۆی لەجیاتی هەمووومان لێدانی پێکەوتووە. هەرهەمووومان لەقاقای پێکەنینمان دا.

دوای چەند هەفتەیەکی تر حەنانە تەلەفۆنی کردو هەواڵی ئەوەی پێدام باوکی حیسام کەوتۆتە نەخۆشخانە، کاتێکی بۆدیاری کردم و ووتی : ئەوکاتە دەتوانی سەردانی بکەی .

کاتێك چوومە نەخۆشخانە بینیم باوکی حیسام لەسەر جێگا پاڵ کەوتووە، قاسم ی برا گەورەی حیسام بەڕوخسارە لووت بەرزیەکەیەوە لەتەك باوکی دانیشتبوو، منیش سڵاوو ئەحواڵپرسینم لەباوکی حیسام کرد بێ ئەوەی سەیری قاسم بکەم.

باوکی حیسام ووتی : لەوڕۆژانە پزیشکەکان مۆڵەتم دەدەن بچمەوە ماڵەوە، حەزدەکەم سەردانێك بۆماڵەوەمان بکەی .

ووتم باوکی حیسام : ئەگەر سەرۆك ووڵاتیش لەبەر دەرگای کۆشکەکەی خۆی سووکایەتیم پێ بکات بەخوا حەزناکەم بەوێنەش ئەم کۆشکە ببینم، بۆیە داوی لێبوردنت لێ دەکەم کەناتوانم، بەهیوای ئەوەم خوای گەورە شیفات بدات و بەسەلامەتی بچیەوە ماڵەوە. ئینجا بێ ئەوەی سەیری قاسم بکەم ماڵئاواییە

لەباوکی حیسام و خزمانیم کرد، بەڕاستی دڵم زۆر تەنگ دەبوو بەدانیشتن لەگەڵ کەسانی دەوڵەمەندو لووت بەرز، چوونکە خۆم بەهەژاری پەروەردەکرابووم، بۆیە بەردەوام حەزم لەدانیشتن لەگەڵ هەژارانە، لەنێو کارخانە دڵم زۆر بەکرێکارەکان خۆشە، بەڕاستی زۆر ڕێزیان لێدەگرم، لەیادم ناچێ کەباوکم بەردەوام کرێکاری کردووە، هەربەهۆی کرێکاریە کەشیەوە کەوتەسەرجێگای مردن،

کرێکارەکان بەمن دەڵێن: ئەگەر تۆ کارخانە جێبهێڵی بەدڵنیاییەوە ئێمە لێرە کارناکەین .

ڕۆژێکیان لەنێو کارخانە لەکاتی کارکردنم، کارمەندێك بەپەلە هات و ووتی : لەتەلەفۆن بەپەلە تۆیان دەوێ، منیش بەپەلە چوومە ژوورەوە تەلەفۆنم هەڵگرت، لەتەلەفۆنەکە گوێم لەناڵەو گریان بوو، پیاوێك سڵاوو ئەحواڵپرسینی لەگەڵ کردم و ووتی: من ناوم (حەسیب)ە و ناسیاوێکی نەسرینی دایکتم، ئێستا وا دایکت گیان دەدا هەناسەی بەرەو کۆتایی دەڕوات، کەمێك پێش ئێستا توانی ناوی تۆو هەردوو خوشکەکەت بێنێ و داوای دەکردن، ئینجا ئەگەر بکرێ تەشریفتان بێنن ئەوە لەمیهرەبانی خۆتانە ! ئەوەش ناونیشانی ماڵەوەیانە،

منیش ووتم زەحمەت نەبێ ئەم ناڵەو گریانە کێ یە دەیکات؟

حەسیب ووتی : کوڕو کچەکەیەتی بەدەوریەوە ناڵەو گریان دەکەن .

تەلەفۆنەکەم داخست و هەستم کرد کارمەندێك پێشتر ناوونیشان و ژمارەی تەلەفۆنی بەئەوان داوە، ئەوکارمەندەش لەماڵەوەبوو، هەر ئەوکات توانیم ژمارەی تەلەفۆنی ماڵەوەیان وەرگرم دەست بەجێ قسەم لەگەڵ کرد و ووتم :

بەخێرایی هەواڵێکی ڕاست و دروستم لەوبارەیەوە پێ بدە. ئـەویش مـاڵی لـەوان نزیك بوو، دەست بەجێ تەلەفۆنی کردەوە هەواڵەکەی پشت ڕاست کردەوە.

منیش داوام لەنەژاد کرد لەکارخانە بمێنێتەوە !

بەپەلـە بۆماڵـەوە چـومەوە و خـۆم گەیانـدە عاتیفـەی خوشـکم و خـەزانی هاوسەرم، هەواڵەکەم پێ ڕاگەیاندن.

عاتیفە زۆر بەئارامی و بێ ئەوەی خۆی سەغڵەت بکات و ووتـی : مـن پـەیمانم داوە نـابێ نـە بەزینـدوێتی و نـە بـەمردوێتی ڕوخـساری دایکـم ببیـنم، ئـەو باوکمـانی بەغەمـەوە کوشـت، بـا خۆشـی بەغەمـەوە گیـانی دەربـچێ، هـەروەها نامەوێ کچ و کوڕەکانیشی ببینم.

خـەزان ووتـی : عاتیفـەخان ئـەرکی دایـك قـەرەبوو ناکرێتـەوە، ئـەو کـچ و کوڕانـەی دایکـت هـیچ گوناهێکیـان نـی یـە، ئـەوان لـەدوای ڕووداوەکـان لـەدایك بوونە.

عاتیفـە ووتـی : بـەبینینی ئـەوانیش ڕابردوویـەکی تـاڵم بەبیردێتـەوە، بۆیـە تکاتـان لێ دەکـەم وازم لێ بهێـنن، ئەگـەر ئێـوەش هەردەچـن توخـوا ناونیـشانی ماڵەوەی خۆمانیان پێ مەدەن، با بەهیـچ شـێوەیەك هاتوچـۆ لـەنێوانمان نـەبێت، چـوونکە بـەبینینی ئـەوان بەرگـەی ئـەو بـێ شـەرمیەی دایکـم نـاگرم، ئـەم سەردانەتان یەکەم و دوا سەردانتان بێ، توخـوا ڕێـز لـەتکاو داوام بگـرە سولتان!

عاتیفە لەقوڵپەی گریانی داو هاواری لێ هەستا .

منیش دەستم لەسەرشانی داناو ووتم : خوشکی گەورەم هەرچی تۆ بلێ ی هەروا دەکەین، تکات لێ دەکەم ئارام بەوە، هەموو قسەو داوایەکانت لەجێگای خۆیەتی .

بەڕاستی من ئەومافەم بەعاتیفە دەدا، چوونکە بەهۆی ئەو ڕابردووە تاڵەوە تووشی ئازاری دڵ و دەروون ببوو، هەر لەبەر ئەمەشە ڕێز لە ویست و خواستەکانی دەگرم، لەبەر ئەوەی لەدوای مردنی باوکم ئەو بۆمن بووبە دایکم و لەباوەشی خۆی گرتم .

کاتێك من و خەزان گەیشتینەماڵەوەی دایکم، چەند کەسێك بەرەو ڕوومان هاتن و ووتیان پێش کەمێك بەر لەئێستا گیانی دەرچوو، منیش بەخێرایی بەرەو ئەو ژوورە چووم کە تەرمی دایکمی لێ بوو، بینیم کچ و کوڕەکەی ئەو بەدەوریەوە ناڵەو گریان دەکەن، منیش کەمێك ئارامم کردنەوە، خۆم نزیك کردەوە بەووردی سەیری ڕوخساری نەسرینی دایکم کرد، لەگەڵ ئەوەش کەگیانی دەرچووبوو کەچی چاوەکانی دانەخرابوو، وەك ئەوەی لەچاوەڕوانی ئێمەدابووبێ، لەڕووخساریەوە ماندووبوونێکی زۆر بەدی دەکرا، بە پیرێژنێکی تەمەن سەدساڵی دەچوو، بەڕاستی زۆر بەزەییم پێ هاتەوە و لەلای سەری دانیشتم، نێو چەوانیم ماچ کردو بەدەستم چاوەکانیم داخست، خۆم پێ نەوەستاو لەقوڵپەی گریانم دا لەدڵی خۆمەوە ووتم : دایەگیان خۆزگە لەماڵی خۆمان خزمەتمان بکردبوایە و هەر لەلای خۆمان گیانت بسپاردایە، من لێرە تۆ بەبێ کەسی دەبینم، بەڵام گوناهی ئێمە نی یە خۆت ئەم بێ کەسیەت هەڵبژارد.

لەوکاتە پیاوێك هاتە تەنیشتم لەتەکم دانیشت و منیش زۆر بەتووڕەیی سەیرم کرد، دەست بەجێ ووتی : نیگەران مەبە من فائیق نیم من (حەسیب) م

ئەوەی تەلەفۆنی بۆکردی و هەواڵەکەی پێدای . منیش تووڕەییەکەم دامرکاوە
حەسیب زۆر بەئارامی دەستی گرتم و ووتی : برا گەورەم لەگەڵ خۆم وەرە، با
بەتەنها لەگەڵ یەکتر دابنیشین .

منیش لەگەڵ ئەو بۆدەرەوەی ماڵەکە چووین، لەحەوشی ماڵەکە خەزان خۆی
ئامادەکردبوو یارمەتی ئەوئافرەتانە بدات کە دەیانویست تەرمەکەی دایکە
بشۆن .

ووتم: ئاغای حەسیب باشتروایە لەنێو ئۆتۆمبێلەکەم دابنیشین .

هەردووکمان دانیشتین و کەوتینە قسەکردن .

حسیب ووتی : سەرەتا با ئەوەت پێبڵێم کەمن برابچووکی (فائیق)م، بەڵام
هەر لەبراگەورەکەمانەوە کە ئێستا نەماوە تا دەگاتە هەموو خزمانمان
هەرهەمووومان لەسەر ئەوکارە قێزەون و بێ ویژدانیە، لەفائیق تووڕەین و
لەسەر ئەوکارە بەردەوام سەرکۆنەی دەکەین، تەنانەت خانەوادەکەی پێشووی
خۆی گشتیان حاشایان لێ کردوو لێ ی جیابوونەوە، خودا لەباوکت خۆش بێ
بەڕاستی دەبوایە هەرزوو ئێمەی ئاگادار بکردا بوایە !

دایکیشت زۆر پەشیمان بۆوە، ڕۆژانە سەرکۆنەی خۆی و فائیق ی دەکرد .

دایکت بە فائیقی دەووت : تۆ خانەوادەکەی منت وێران کرد.

فائیقیش دەیووت : وەك تۆ خانەوادەکەم وێران بوو .

بەڕاستی لەماوەی ئەوبیست ساڵە هەموو ڕۆژێك بۆدایکت غەم و مەینەت بوو
ڕۆژانە بەگریانەوە دەیووت : زۆر بەبێ ویژدانی دەستم لەسوڵتانی دڵ و گیانە
هەڵگرد .

دایکت زۆر حەزی دەکرد لەنزیکەوە بتبینێ و سەیرت بکا،

دوومانگ بەر لەئێستا بۆ نەخۆشخانەم برد، لەڕێگا ووتی : حەسیب چارەسەرو دەرمانی من تەنها بینینی (سوڵتان)ە، توخوا بۆلای ئەوکارخانەم ببە کە ئەو کاری لەنێو دەکات ! ئەگەر لەدوورەوەش ببینم دڵم ئاو دەخواتەوە و نەخۆشیم نامێنێ .

ئێمەش پێشتر زانیاریمان هەبوو کەتۆ لەوکارخانە کاردەکەی و بەم ئۆتۆمبێلە هاتووچۆ دەکەی .

ئێمەش بەرەو لای کارخانەکەتان هاتین، لەنزیکەوە ئۆتۆمبێلەکەم ڕاگرت، دایکت لە ئۆتۆمبێلەکە هاتە خوارەوە ووتم : ئەگەر حەز دەکەی بۆلای ئەوت دەبەم! ووتی : نامەوێ ئەو من ببینێ، چوونکە دەزانم لەسەر جیابونەوەم سووکایەتیم پێدەکات و نەفرەتم لێ دەکات .

ووتم زۆرچاکە من لێرەوە چاودێری دەرگای کارخانە دەکەم، هەرکەهاتە دەرەوە ئاگادارتان دەکەمەوە .

ووتم : ئاغا حەسیب خۆزگە بەمنت نیشان دابوایا! من پەیمانم دابوو ئەگەر بیبینم ڕێزی لێ بگرم و چاك و چۆنی و ئەحواڵپرسینی لەگەڵ بکەم .

حەسیب ووتی : بەڕاستی من زۆر داوام لێ کرد، بەڵام ئەو دەترسا لەوەی کەتۆ بەقسان ئازاری بدەی .

بەهەر حاڵ نزیکەی دوای دووکاتژمێر بەم ئۆتۆمبێلە لەکارخانە دەرچووی، منیش ئاگادارم کردەوە کە ئەوە سوڵتانی کوڕتە، لەکاتی تێپەڕبوونت بەم ئۆتۆمبێلە! تۆ چاوت لای ئەو نەبوو، بەڵام ئەو بەتەواوەتی و بەپەرۆشەوە

سەیری دەکردی، لەدوای تێپەڕ بوونت هاتەوە نێو ئۆتۆمبێلەکەم، وەك کانیاو ئاو لەچاوەکانی دەهاتە خوارەوە، دەیووت قوربانی تۆبم سولتان گیان، ڕەنگ و ڕوخساری باوکی خۆت هەلگرتووە، قوربانی گەنجایەتیت بم.

ئیتر بەم شێوەیە بەناڵەو گریانەوە لەنێو ئۆتۆمبێلەکە لەتاو بینینی تۆ، حاڵی پەشۆکاو بەردەوام دەگریا، هەرچەندی هەوڵم دا ئارامی بکەمەوە، بەڵام منیش خۆم پێ نەوەستاو لەقوڵپەی گریانم دا.

کاتێك گەیشتینەوەماڵەوە ووتی : ئێستا هەست دەکەم دڵم بەبینینی سولتان گیان ئاوی خواردەوە، حسیب! من لەچاکەی تۆ دەرناچم، ئەگەر ئەوچاکەیەش بکەی، لەدوورەوەش عاتیفە و حەنانەش ببینم! ئەوکاتە باکم لەمردن نابێ و بەتەواوەتی دڵم ئارام دەبێتەوەو دادەمرکێتەوە !

منیش پەیمانم پێدا کە هەر زانیاریەك لەبارەی ئەوان دەستم بکەوێ ئەوکارەدەکەم، هەرچەندە هەوڵمدا بەڵام بەداخەوە تا ئێستا هیچ هەواڵێکم لەبارەی ئەوان دەست نەکەوت، نەم زانی ناونیشانی ئەوان لەکوێ یە.

ئیتر لەوقسانە بووین خەزان لەماڵەکە هاتە دەرەوە بۆلای ئێمە هات و ووتی : تەرمەکە ئامادەکراوە بۆ گۆڕستان! حەسیب دەست بەجێ لە ئۆتۆمبێلەکەم هاتەخوارەوە و دەستم گرت و ووتم : داوا لەبەرێزت دەکەم بەهیچ شێوەیەك نامەوێ فائیق ی خیانەتکار لێم نزیك ببێتەوە .

حسیب ووتی : هەرچی تۆ ئەڵێ ی بەسەرچاو، دەست بەجێ تەرمەکەیان دەرهێنا بەرەو مزگەوتیان برد، بەمەبەستی نوێژکردن لەسەری، ئینجا بەڕێ کەتین بۆ گۆڕستان .

لەڕێگا خەزان ووتی : سوڵتان تاوەکو ڕێ و ڕەسمی ناشتنی تەرمی دایکت بەڕێوە دەچێ هیچ قسەیەك نەکەی! ووریابە هەستی ئەو کوڕو کچەی دایکت ئازار نەدەی .

کاتێك گەیشتینە گۆڕستان لەکاتی بەخاك سپاردنی دایکم سەیری کەسێکم کرد لەنێو پیاوەکان تەنها ئەو چاویلکەیەکی ڕەشی لەچاوکردبوو، دڵنیابووم کە ئەوە (فائیق)ی خیانەتکارە، بینیم سەیری من دەکا، منیش خۆم پێ نەوەستاو ووتم : ئەوەی ئێستا بەڕەشی دونیا دەبینێ لەڕابردوو ژیانی خەڵکیشی ڕەش و تاڵ کرد، ئەم جۆرە ناپیاوانە لەهەردوو دونیا تەنها سەرشۆڕیان بۆدەمێنێتەوە .

بینیم چاویلکە ڕەشەکەی لەچاو هێنایە خوارەوە و خستیە ژێر پێ یەکانی، وە پیاوانی دەوروبەری زۆر بەتووڕەیی سەیری ئەویان دەکرد، خەزان لەنێو ئافرەتەکان هاتە دەرەوە بۆلای من هات، منیش ووتم : خەزان بابڕۆین .

لەکاتی ڕۆیشتنمان، ئاغا حەسیب لەگەڵ دووپیاوی بەتەمەن بەدوامان هاتن و دەستیان خستە سەرشانم و ووتیان : بۆهەرشتێك کەئێوە بیڵێن ئێمە ئامادەین بۆ خانەوادە بەڕێزەکەتان ئەنجامی بدەین !

بەڕاستی فائیق هەموومانی شەرمەزاری خانەوادەکەتان کرد، بۆیە داوای لێبوردنتان لێ دەکەین! بەدەم ڕۆیشتنەوە لەوقسانە دابووین تا گەیشتینە دەرەوەی گۆڕستان، کاتێك لە ئۆتۆمبێلەکەمان نزیك بووینەوە، سەیرم کرد فائیق بەدوامانەوەیە،

ووتم : فائیقی خیانەتکار: ئاگاداربە سنووری خۆت مەبەزێنە، ئەگینا پاداشتی ڕابردووت بەجۆرێك وەردەگری کە بەشێوازێکی تر لەم گۆڕستانە بتنێژن .

فائیق لەجێگای خۆی وەستا، هەستی بەشەرمەزاریەکی زۆر کرد.

ووتم فائیق ئەگەر بمانزانیایە تۆ گورکی و دراوسێ نی، ئەوکات سەگێکمان لەبەر دەرگا دەکردە پاسەوان، بۆ ئەوەی بەتۆ بڕەویایەو دەست و پێتی بگەزیبایە .

خەزان ووتی : سوڵتان توخوا ئارام بەوە !.

بینیم فائیق بەئارامی پشتی لەئێمەکردو گەڕاوە بۆنێو گۆڕستان .

منیش داوای لێبووردنم لەحەسیب و دووپیاوە بەتەمەنەکە کرد،

حەسیب ووتی : نا بەپێچەوانەوە، مافی خۆتە قسەکانت هەمووی لەجێگای خۆیەتی، دەزانم دڵت بۆ دایکت دەسوتێ، غەمی ئەوەت نەبێ، ئەو سەرکۆنەی زیاتری دەکرێ .

لەکاتیماڵئاوایی کردنمان لەئەوان، ووتم: ئاغا حەسیب داواکاری ئێمە تەنها ئەوەیە نامانەوێ دەستمان بەبرینی ڕابردوو دابێنین و خۆمان ئازار بدەینەوە،بۆیە لەسەر داوای خانەوادەکەم، نامانەوێ کەس هاتوچۆمان بکات، هەروەها ناونیشانی کارخانەکەمان بەکەس مەدەن !

حەسیب ووتی : تەنها وەکو دۆستێك قبولم بکە، جارجار تەلەفۆن بۆکارخانە دەکەم، حەزدەکەم سڵاوو ئەحواڵپرسینت لەگەڵ بکەم !

بەڕاستی حەسیب زۆر بەڕێزو دڵسۆز بوو، هەستم دەکرد ئەو بەتەواوەتی هەستی بەئازارو مەینەتەکانی خانەوادەکەمان کردوە، بۆیە منیش حەزم دەکرد سڵاوو ئەحواڵپرسینم لەگەڵ ئەوهەبێت، ئینجا ماڵئاوایم لەحەسیب و دووپیاوە بە تەمەنەکە کرد و ئەوانیش زۆر بەڕێزەوە ئێمەیان بەڕێ کرد .

لەڕێگا خەزان ڕووی تێکردم و ووتی : سوڵتان من چیم پێ ووتی ؟ لەیادت چوو کە ووتم خۆت ڕاگرەو قسە مەکە، بەڕاستی نەدەبوایە بەوقسانە ئازاری ئەو خەڵکە و گیانی دایکت بدەی !

ووتم : بەڕاستی خۆم پێ نەگیرا، دەزانم هەڵەبووم ئێستاش ویژدانم ئازاری دڵم دەدات، دەزانم من ئازاری مردووەکانی ئەو گۆڕستانەشم دا، بەهەر حاڵ خەزان داوای لێبوردن لەتۆش دەکەم .

بەڕاستی ئەو ڕۆژی لەگەڵ بینینی تەرمی دایکم و بیستنی قسەکانی ئاغا حەسیب، تەمەنی یازدە ساڵانەم هاتەوە یاد، کە ئەوکات ناخۆشترین ژیانمان بەسەر دەبرد، هەمان ژیانە تاڵەکەی ئەوکاتەم هاتەوە مێشك و دڵ وزارم .

ئێستاش بەردەوام ئاغا حەسیب تەلەفۆن بۆکارخانە دەکات و بەیەکەوە گفت و گۆ دەکەین، کچ و کورەکەی دایکم سڵاوومان بۆ دەنێرن و منیش بەڕێزەوە سڵاویان بۆ دەنێرم، ئەوانیش ئەومافە بەئێمە دەدەن کەلێیان دووربین و بۆ هەموو لایەکمان چاکترو باشترە .

دوای ماوەیەك (عارف) ی باوکی حیسام کۆچی دوایی کرد، لەدوای کۆچ کردنی ئەو، کێشە کەوتە نێو خانەوادەکەیان لەسەر سەروەت و سامانی باوکیان، قاسم و دووبرایەکەی تری برێکیان لەبەشە میرات دا بەحیسام و سێ خوشکەکانیان، بەڵام دەستیان بەسەر سامانێکی زۆری باوکیان داگرت و بەناوی خۆیان کرد، کێشەکە گەیشتە نێو دادگا، خوشکەکانی حیسام سکاڵایان لەسەر برایەکانی تریان تۆمار کرد . بەڵام حەنانەی خوشکم قبوڵی نەکرد حیسام سکاڵایان لەسەر تۆمار بکات و لێ ی نەگەڕا بچێتە نێو کێشەکە، هەربۆیە حیسام بەتەواوەتی پەیوەندی لەگەڵ برایەکانی پچڕاند، بڕیاری دا لەگەڵ حەنانەی خوشکم لەلای

ئێمـە خانوویـەك بكـڕن، سـوپاس بـۆ خـوا توانیـان خانوویـەكی ڕێـك و پێـك لەكۆڵانەكەی ئێمە بكڕن و بـوون بەدراوسـێ ی ئێمـە، ئینجا نـاوی خـۆی خـستە سەر قوتابخانەیەكی (ناوەندی) نزیك لەخۆمان، وەك مامۆستا لـەو قوتابخانەیـە وانە دەڵێتەوە، ئێستاكەش تەنها حیسام هاتوچۆی ماڵی خوشكەكانی دەكات .

سـوپاس بۆخـودا مـاڵی ئێمـەو عاتیفـە و حەنانـەی خوشـكم لەیـەك كۆڵـان كۆبووینەوە، هەموو دوای عەسرێك لەیەكێ لەماڵەكانی یەكێكمان بەدەوری یەك كۆدەبینەوە، بەتایبەتی هـەموو ڕۆژانێكی هـەینی لەماڵـەوەی حیـسام و حەنانـە لـەدوای عەسـر تـا درەنگـانی شـەو كۆدەبینـەوە و ئێوارەكـەی بەیەكـەوە نـان دەخـۆین، ئینجـا لەگـەڵ نـەژاد و حیـسام لـەبارەی شـیعرو پەخـشان دەدوێـین و بەسەرهات و قسەی خۆش دەكەین، خەزان و عاتیفـە و حەنانـە و منداڵـەكانمان بەدەورمان كۆدەبنەوە گوێمان لێ ڕادەگرن .

- جارێكیان من و عاتیفە و حەنانە بۆ سـەردانی بـاوكم چووینە گۆڕسـتان هـەر لەنێو گۆڕستان عاتیفە و حەنانە خۆیان داوایان لێكردم سەردانی گۆڕی دایكمـان بكەین، منیش ئەوانم لەگەڵ خۆم بۆ سەر گۆڕی دایكمان برد، لەكاتی وەسـتانمان لەسەر گۆڕی دایكمان عاتیفە ووتی : دوای مردنی بۆمـان دەركـەوت كـە دایكمـان لەدوای جیابوونەوەی و دابڕانـی لەئێمـە بـەم هۆیـەوە تووشـی غـەم و پـەژارەكی زۆر ببوو، وە پەرۆشی ئەوەبوو ئەگەر بۆجارێكیش بـێ ئێمـە ببینـێ، بـەڵام چـی بكـەین؟ ئـەو هـەموو دەرگایـەكی ژیـانی خـۆی لەئێمـە داخـست، خۆزگـە بـەر لـەمردنی بەوحاڵـەی ئـەومان بزانیبوایـە، ئـەوكات سـەردانێكمان دەكـردو دڵنەوایمان دەكردو كەمێك لەئازارەكانی ئەومان كەم دەكردەوە، تـەنها ئـەوەماوە بڵێم خودا لەئێمەو لە ئەویش ببوورێ !

لەگەڵ ئەو قسانەی عاتیفە، بینینم لەچاوەکانی حەنانە فرمێسکی میهرەبانی دێتە خوارەوە، بەڕاستی ئەوسەردانەی عاتیفە و حەنانە بۆ سەر گۆڕی دایکم زۆر خۆشحاڵی کردم، لەوکاتەوە بڕیارماندا هەرجارێك سەردانی گۆڕی باوکمان بکەین، دەبێ گۆڕی دایکشمان بیر نەچێت و سەردانی بکەین .

بەڕاستی لەو ماوەیەوە تا ئێستا ژیانمان خۆشی و ئارامیەکی یەکجار زۆری بەخۆوە بینیوە .

لەنێو هەر سێ هەینیەك هەرسێ خانەوادەکەمان سەردانی ماڵی حاجی مورتەزا دەکەین لەگەڕەکە کۆنەکەی خۆمان، دوای عەسرەکە لەنێو باخچەکەی ماڵی حاجی دادەنیشین، من و حیسام و نەژاد و ماجیدی کوڕی حاجی، بەدەوری حاجی دادەنیشین، حاجی و حیسام شیعرو پەخشانی شیرازی بۆئێمە دەخوێننەوە و مانایەکەی لێك دەدەنەوە، هەردووکیان زۆر شارەزان لەشیعرەکانی حافیزو سەعدی شیرازی، بەڕاستی لەقسەو بەسەرهاتی خۆش تێرنابین، من لەناخمەوە دەگەڕێمەوە بۆ ئەو سەردەمەی کە باوکم و حاجی بەیەکەوە دادەنیشتن و منیش گوێم بۆ هەردووکیان دەگرت .

ژیانی مرۆڤایەتی هەمووی یادەوەریە، مرۆڤ بەردەوام چێژ لەیادگاریەکانی وەردەگرێ ، هەندێ جار ئەگەرچی ڕابردووەکەی تاڵ بووە، بەڵام لەداهاتوو لەگەڵ باس کردن و بەیاد هاتنەوەی یادگاریەکەی، خۆی لەخۆیدا ئەویادگاریە شیرین دەبێت .

جارێکیان لەو کۆڕو مەجلیسە خۆشە ڕووم لەحاجی مورتەزا کردو ووتم : حاجی مورتەزا بەزیرەکی و دڵسۆزیەکەت توانیت لەم خانووە کوڕی

دەوڵەمەندترین کەسی ئەم شارە و کوڕی هەژارترین کەسی ئەم شارە بەدەوری خۆتا کۆبکەیەوە .

حاجی بەزەردەخەنەوە سەیرێکی کردم و ووتی : ئەوەی ئێمەی بەدەوری یەکتر کۆکردۆتەوە تەنها ئیمان و بیروباوەڕە، بێ گومان هەرکۆڕو مەجلیسێك پڕبێ لەئیمان و زانست و دانایی، بەدڵنیاییەوە خوای بەرەکەتی دەکەوێتێ، ئەوکاتەش هەبوونی و نەبوونی هیچ بایەخێکی نابێ لەم کۆڕو مەجلیسە، لەبەر ئەوەی دڵ و ژیرو ڕۆح لەهەموو شتێ دەوڵەمەندتر دەبن ، من بەئومێدی ئەوەم کە لەدوای منیش ئەم دۆستایەتی و تەبایی یەی نێوانتان بەردەوام بێت، وە پەرە بەم جۆرە ژیانە بدەن، کە ئێستا ئێوە چاك دەزانن ئاسوودەیی لەم جۆرە کۆڕو مەجلیسانە دایە، هەروەها بەئومێدی ئەوەم هەروەك چۆن ئیمان و بیروباوەڕ لێرە هەموومانی بەدەوری یەکتر کۆکردۆتەوە، بەهەمان شێوە لەڕۆژی دوایش لەبەهەشتی نەبڕاوە بەدەوری یەکتری کۆمان بکاتەوە و کۆببینەوە !!!

# ووتەکانی (( ژیان ))

یەحیای کوڕی مەعاز فەرموویەتی : مرۆڤی خاوەن ژیرو ئاقڵ سێ نیشانەی هەیە

١ ـ دونیا بەسادەیی وەردەگرێ، پێش ئەوەی ماڵئاوایی لەدونیا بکات .

٢ ـ کار بۆ گۆڕەکەی دەکات، پێش ئەوەی بچێتە نێوی .

٣ ـ ڕەزامەندی خودا بەدەست دێنێ، بەر لەوەی بچێتەوە لای ئەو .

ـــ ئێمـە هـەتا لـەدوونیاین تەمـەنی خۆمـان بـەگۆترە دەدەیـن، ئامـادەنین تەمەنەکەمان هەڵسەنگێنین .

ـ ڕیشەی ناکۆکیەکان چوارن :

١- پلەو پایە ٢ - ژن ٣ - زەوی ٤ –پارەو پول

ـ زانای گەورە ئیبن جوزی (ڕەحمـەتی خـوای لێ بێ) فەرموویـەتی : وویـستم کتێبێك بنوسمەوە بـەناوی ((المنـتظم في تـأريخ الملوك والأمـم)) بـەدوای هەنـدێ زانیاری ڕۆیشتم و بینیم زۆرێك لەپاشایان و وەزیران و زانایان و کاربەدەستان و شاعیران و ئـەدیبان کەوتۆنەتـە بـەر گەمـەو گاڵتـەی ژیـان و چارەنووسـێکی پـڕ لەشـەرمەزاری، ئـەوەش هـەموو بـەهۆی سـووربوونیان لەپلـەو پایـەو خـۆش ویستنیان و پشت بەستنیان بەژیانی دونیا.

ـ جارێکیان ئیمامی ئەوزاعی ڕەحمـەتی خـوای لێ بێـت : ئامۆژگـاری خەلیفـە ((مەنـصور))ی دەکـرد پـێ ی ووت : ئـەی پێـشەوای بـڕواداران ئەگـەر موڵـك و سامانی دونیا بۆ دەسەڵاتدارانی پێش تۆ بمابووایە بێ گومان نەدەگەیـشت بـەتۆ، کەواتە چۆن بۆتۆش نامێنێتەوە ئاواش بۆکەسانی دوای تۆش نامێنێتەوە.

- دونیا هەموو زۆران بازیە، باشترین پاڵەوانی، ئەو بڕوادارەیە ژیان بەسادەیی بەسەردەبات و بەبەشی خۆی ڕازی دەبێ .

- ژیانی دونیا خۆشیەکەی هەتا سەرو بەردەوام نیە بەڵکو تەنها لەنێو مەینەتەکانی خۆشیەکی کەمت دەست دەکەوێ و پاشان لەدەستت دەچێ.

گەورە شاعیری کورد مەلا قانیع لەپارچە شیعرێکی دەڵێ :

**با سێ قات نەبێ خانوو سەراکەت**

**پارەی قاتێکیان بدە بەبراکەت**

**دەوڵەمەند مەڵێ هەوڵی بۆخۆیە**

**نەبوونی برات نەبوونی تۆیە**

- لەلای داناو هۆشمەندەکان هەر ڕۆژێك ژیانێکی تازەیە .

- هەرکەسێ ڕازی نەبێ بەوبەشەی لەدونیا هەیەتی، ئەوە بێ گومان بەچاوچنۆکی چاو دەبڕێتە دەست و سامانی خەڵك.

- دڵنیابە ئەگەر مردن قبوڵ نەکەی، ژیانت هیچ مانایەکی نابێ .

- خودا هەرگیز لەئێوە ناپرسێ لەچ کات و لەچ شوێنێك خزمەتت کرد، بەڵکو دەپرسێ مەبەست و ئامانجت لەخزمەت کردن چی بوو ؟

- هەرکەسێ ڕووی تەنها لەدونیا بکات ئەوە خۆی لەدانایی بێ بەش دەکات .

- ناخۆشترین شت لەدونیا دابڕانتە لەکەسی خۆت و دۆستی نزیکت .

یەکێ لەدەوڵەمەندە گەورەکانی جیهان لەسەرە مەرگ ئەم چەند ووشەی دەربڕی و ووتی : هەرچەندە من لەخانەوادەیەکی هەژارو کەم دەرامەت گەشەم کرد، بەڵام دواتر خۆم بووم بە یەکێ لەدەوڵەمەندەکانی جیهان.

توانیم بەپارە جوانترین کۆشك دروست بکەم، بەڵام ژیانی بەردەوام نا .

توانیم بەپارە کەل و پەلە ڕازاوەکانی ماڵەوە بکڕم، بەڵام خەوو حەوانەوە نا .

توانیم بەپارە ئافرەت و خزمەتکار بکڕم بەڵام دڵ نا .

توانیم بەپارە هەموو جۆرە دەرمانی چارەسەر بکڕم، بەڵام لەش ساغی نا .

توانیم بەپارە بەنرخترین کاتژمێری دەستی و دیواری بکڕم، بەڵام کات و زەمان نا .

توانیم بەپارە کتێبخانەیەکی گەورە لەماڵەوە دابنێم، بەڵام زانست و دانایی نا.

من هەموو ژیانم تەرخان کرد بۆکۆکردنەوەی ماڵ و سامان، کەچی ئێستاش هەموو ماڵ و سامانەکەم توانای ئەوەیان نیە لەمەرگ دوورم خەنەوە، خۆزگە بەشێکی ژیانم تەرخان بکردایە بۆژیانی نەبڕاوەی دوای مردن !.

وآخر دعوانا أنِ الحَمدُللهِ رَبِّ العالَمين .

# سەرچاوەكان

- صيد الخاطر ابن الجوزي
- إحياء علوم الدين ئيمامى غەزالي

هەروەها بەسوود وەرگرتن لەچەند ژمارەيەك لەگۆڤارى فارسى بەناوەكانى : -

((راه زنـــدگى)) و ((روزهـــاى زنـــدگى)) و ((خـــانواده)) وە لەگـــەڵ چـــەند سەرچاوەيەكى تر .

## ناوەرۆك

بێ حەیایی باوە ئەمڕۆ قوڕ بەسەردا ، کوا حەیا
کەندەڵان سەربەرز و شادە گەرلێمان ونبێ چیا
گوڵ ئەگەر ئەقڵی ببێ ، سەری لە خاك دەرناکا
چونکە ڕۆژی درك و داڵە و گەرمی بازاڕی گیا
وا لە هەورا سەریان ون بوو ڕۆژ و مانگ
شەمشەمە کوێریش ئەڵێ: من نامەوێ شوعلە و چرا
هەنگ لە داخی بێ گوڵی نازانێ چی پەیداکا
بۆیە ئەڵێ: نەمبینیایە ئەم زەمانە هەزار بریا
ئەو ڕۆژگارە بەڕێ کەت و باوەش گرێ بە دونیا
گورگ ببێ بە شوانی مەڕ ، دز ببن بە ئەولیا

چاپخانەی ڕۆژهەڵات/هەولێر